## پوختەکرن وپاڵاوتن

پوختەکرن Extraction ئەو ژێك جوداکرنا ماددێن تێکەلەیە بکارئینانا توێنەری، ب پشتبەستن ل سەر پلا توانەوە (توانەوەیەتی Solubility) بۆ نموونە، دشێین خیزی ژخوێ جوداکەین (پوختە کەین) ب تواندنا خوێ دئاڤێدا وخیز دێ ل بنێ ئامانی نیشیت. وپاشی، دشێین خیزی بزڤرینین ب جوداکرنێ ژئاڤێ وکۆمکرنا خوێ ب هەڵماندنا ئاڤێ دبیت. هندی (پاڵاوتن Filtration)ە ژێك جوداکرنا مادان دبیت ل سەر جوداهیا بارێن فیزیایی یان جوداهیا قەبارێ تەنوکێن وان. بۆ نموونە، شلە ژرەقی جودا دبیت ب تێکرنا تێکەلەی بۆ ناڤ کاغەزا پاڵاوتنێ دکوڤکێدا، یان ئەگەر رەق چرتربیت ژشلەی، ماددێ رەق نیشتنێ ل بنێ ئامانی جودا دبیت، وشلەی ل سەر ڤە دهێلیت. ل وێرێ، دشێین شلەی جودا بکەین دا رەق بدەست مە بکەڤیت.

### نیشتن وجوداکرن

1. ئامانەکێ قەبارە گونجای پڕ بکە ژوی تێکەلێ رەق – شلێ مامۆستاییێ تە دایەڤتە. ئامانی بهێلە هەتا تەنوکێن رەق ل بنی جێگیر دبن وشل جودا دبیت.
2. ئامانی ب دەستەکێ خۆ بگرە. تولێ شیشەی ب دەستێ دیتر بگرە ودانە ل سەر دەڤێ ئامانی. لێڤا ئامانی پیچەك خارکە هەتا شلە هێدی دەست ب رێژتنێ دکەت، وبەردەوامی، وەکی یا دیار ل شێوێ (أ).

### پاڵاوتن

1. کاغەزەکا پاڵاوتنێ وەکی یا دیار ل شێوێ (ب) ئامادە بکە. ب درێژایا تیرێ وێ بپێچە وپاشی جارەکا دی بۆ چارێکەکێ بپێچە. گوشا کاغەزا پاڵاوتنێ ببڕە، وڤەکە دا قوچەکەك پێك بێت. ئەڤێ قوچەکی دانە دناڤ کوڤکێدا.
2. بۆریا کوڤکێ ل دەستپێکێ بکە دناڤ ئامانێ پاڵاوتنێ دا، یان کوڤکێ هەلاویسە ل سەر ئامانی بکارئینانا بازنێ خرێ کانزای، وەکی یا دیار ل شێوێ (ج).
3. کاغەزا پاڵاوتنێ ب پیچەکا ئاڤا دلۆپێنراو تەڕ بکە، بکارئینانا بوتلێ شیشتنێ Wash botlle ، کو کاغەز ب دیوارێ کوڤکێ ڤەدمینیت وقورنەتی برِی ژکاغەزێ ناهێلیت پەقیشکێن هەوای دناڤبەرا کاغەزا پاڵاوتنێ ودیوارێ کوڤکێ پەیدابن.
4. وی تێکەلێ تە دڤێت بپالێوێ بکە سەر کاغەزا پاڵاوتنێ ب رێیا توولێ شیشەی. توول ل ڤێ کردارێ تێکەلەی بەرەڤ کوڤکێ دبەت، ژبۆ کێمکرنا بەربەلاڤ بوونا شلەی بۆ ژدەرڤە.




**شێوێ (أ)**
نیشتن وجوداکرن




**شێوێ (ب)**

5. رێ نەدە بلندبوونا ئاستێ تێکەلەی دناڤ کوٚڤکێدا ل سەر ئاستێ لێڤا بلندا کاغەزا پالاوتنێ.

6. بوتلێ شیشتنێ بکاربینە بوٚ ئینانا خارێ یا هەمی تێکەلەی بوٚ دناڤ کوٚڤکێ دا.

## پالاوتن ب ڤالاکرنێ

1. ئامادەکاریا پارچکا T تاقی بکە. حەنەفیا ئاڤێ ڤەکە. دڤێت ئاڤ بهێت بێی برینا پیچ پیچە یان بلەز ل دەمێ پەیداکرنا ڤالاکرنێ. وبوٚ تاقیکرنا پێك هاتنا ڤالاکرنێ، کونا دەستکێ ئاسویی بوٚ پارچکا T ب تلا بەرانێ یان شەهدێ بگرە، وئەگەر تە هەست کر کو تلا تە بوٚ ژناڤدا یا دچیت، ئانکو ئەڤە ڤالاکرن هاتە پەیداکرن. هشیاری هژمارا خولێن حەنەفییێ یا پێدڤی بوٚ پەیداکرنا رێتنا (چوونا) ئاڤێ یا گونجای بوٚ رویدانا ڤالاکرنێ ببە.

2. حەنەفیا ئاڤێ بگرە، وبوٚریا ڤالاکرنا مەتاتی ب پارچا ئاسویی ژپارچکا T ببەستە (تە نە ڤێت ئاڤ دناڤ بوٚریان دا بچیت).

3. لایێ بوٚریا مەتاتی ب دەستکێ رەخی یێ کەمولێ پالاوتنێ ببەستە. بوٚ تاقیکرنا ئامادەیا ڤالاکرنێ حەنەفیا ئاڤێ ڤەکە. (پێنگاڤا 1) وپانیا دەستێ خوٚ دانە ل سەر کونا کەمولێ قوچەکی. دڤێت تو هەست ب ڤالاکرنێ بکەی، دەستێ تە بوٚ ژناڤدا رادکێشیت. ئەگەر تو هەست ب چ راکێشانێ نەکەی یان ئەو یا لاواز بیت، لەزاتیا ئاڤێ زێدە بکە. ئەگەر لەزاتیا ئاڤێ بوٚ رویدانا ڤالاکرنێ تە کێم کر، ئاڤێ بگرە وئەسەح بە ژباش بەستن وگەهاندنا بوٚریان.

4. توولا کوٚڤکا (بوخنەر) یا قوچەکی بکە دناڤ قەپاخا مەتاتی دا، هەتا قەپاخ بگەهیتە سێ یەك یان سێ چارێك ژدرێژیا توولێ. پاشی کوٚڤکێ جێگیر بکە دناڤ دەڤێ کەمولێ قوچەکی دا وەکی یا دیار ل شێوێ (د).

5. کاغەزەکا پالاوتنا گونجای یان پارچەکا بازنەیی ژکاغەزەکا مەزن ببرە دا کونێن هەین ل بنێ کوٚڤکا (بوخنەر) بپوشیت. حەنەفیا ئاڤێ ڤەکە وەکی ل پێنگاڤا 1، کەمولێ پالاوتنێ ب دەستەکێ خوٚ بگرە وپانیا دەستێ دی دانە ل سەر کونا کوٚڤکێ دا هەست ب ڤالاکرنێ بکەی.

6. وی تێکەلێ تە دڤێت بپالێوی بکە دناڤ کوٚڤکێدا وبوتلێ شیشتنێ بکاربینە دا تێکەلە ب تەمامی ژئامانی بوٚ کوٚڤکێ بهێتە خارێ.



**شێوێ (د)** پالاوتن ب ڤالاکرنێ



**شێوێ (ج)** پالاوتن ب گرانییێ

ناڤ ............................................ ڕۆژ ............................ پۆل ..............................

## تاقیکرنا 2 | مادده و گوهۆڕین: تێکەلێ بێتزا (ب دلێ خۆیە)

تێبینی: تاقیکرنەکا (ب دلێ خۆیە) ل مالێ یان ل تاقیگەها کیمیاییێدا دهێتە بجهئینان (ل دویڤ دیتنا مامۆستای).

**ئەنجامێن فێرکرنێ**

- توانا کرداری بۆ دەستنیشانکرنا پێکهاتێ پولێنکرنا تێکەلەی **دیارکەت**.
- ڕێیێن ژێك جوداکرنا پێکهاتێن تێکەلەی **دیارکەت**.

**پێشەکی**

پتریا ئەو خارنێن دخوین ب شێوێ تێکەلەی دبن. بۆ نموونە بێتزا تێکەلەکە ژهەڤیری وزەلاتێ (ئاڤا باجانکا) وپەنیری، زێدەبارا تێکەلێ ب سەرهڤە. ل ڤێ تاقیکرنێ دا دێ ڕابین ب ئامادەکرنا پارچەکا بێتزا ودێ بەلگێ دەی کو ئەو پێك دهێتە ژ تێکەلەی.

**مادده و ئامێر**

- قالکەکا تێکەلێ پێکئینانا بێتزایێ، یان وەکی وی.
- سێنیا بێتزایێ.
- چەقۆیا برینا بێتزایێ.
- دەستگۆرکێن گەرمێ بگونجن.
- فرن.

**ڕێکا کاری**

1. هەڤیرێ بێتزایێ ئامادە بکە ب پشتبەستن لدویڤ پێزانینێن هاتین ل سەر قالکێ، تێکەلێ سەرهڤە بکە سەر، ولدویڤ پێزانینان بکە دفرنێدا.
2. دەستگۆرکان بکاربینە بۆ ئینانا دەرێ یا سێنیا بێتزایێ ژفرنێ، پاشی فرنێ ب ڤەمرینە.
3. صەوکا (قالبێ) بێتزایێ بۆ پارچان ببڕە، پارچەکێ هەلبژێرە بۆ پشکنینێ وتو یێ بەرسڤێ ل سەر ڤان پسیاران دەی پشتی تاقیکرنێ.

**پاقژکرن وڕزگارکرن ژبەرمایکان**

4. جهێ کاری پاقژ بکە وهەمی ئامێران. ئامێران بزڤرینە جهێن وان، دەستێن خۆ باش بشۆ ب ئاڤێ پشتی دوماهیك هاتنا کاری.

**پرسیار**

1. **هزرین شیکاری:** پولێنکرنا بێتزایێ بکە بۆ تێکەلەکێ چووین یەك یان نەچووین یەك، وئەگەران شرۆڤە بکە.

______________________________________

______________________________________

______________________________________

______________________________________

2. **هزرێن گرێدای ب بابەتی ڤە**: شرۆڤە بکە چەوا بەلگە دهێتە دان. بەلاڤەکرنا چینا سەری یا بێتزاییێ دیار دکەت کو تێکەلە.

## دەرئەنجامێن گشتی

1. **ڕێکێن شیکاری**: هزرێ ل چەوانیا ڕاکرنا چینا سەری یا بێتزاییێ ئەگەر تو حەژێ نەکەی. چەوا بەلگێ ددەیە ڤی کاری کو ب ڕاستی بێتزا تێکەلەیە؟

2. **هزرێن کارپێکەری**: هویرکێ لەیمونێ دئاڤێدا دتوێتەوە. ئەرێ ئەو گیراوێ بەرهەمهاتی تێکەلە یان ماددەکێ خاوێنە؟ ڕوونکرنەکێ بدە.

3. **هزرێن کارپێکەری**: ماددەکێ ئیسفەنجی پێك دهێت ل دەمێ تێکڤەدانا تێکەلێ شەکرێ دناڤ سپیلکا هێکێ. ئەو هەوایێ دچیتە دناڤ ئاڤێدا ل دەمێ تێکڤەدانێ دا. شێوازێ ئیسفەنجی ددەتە تێکەلەی. ئەرێ ئەڤ ماددێ شێوە ودەست لێدانا ئیسفەنجی تێکەلەکێ چوون یەکە یان نە چوون یەکە؟ ئەگەرێن خۆ دیار بکە وبارێ یان بارێن هەبیت ل ڤی ماددەیدا شرۆڤە بکە.

ناڤ ................................................ ڕۆژ ................................ پۆل ..........................

## تاقیکرنا 3

# نیشاندەر (الأستدلال) ل سەر گوهۆڕینا کیمیایی

### ئەنجامێن فێرکرنێ

- **سەح دکەتە** گرۆڤێن پەیدابوونا گوهۆڕینا کیمیایی نیشان دکەت.
- دەردئێخیت ژ **تێبینیا** کو ماددەکێ نوی پێکهات.
- **دیار دکەت** پەیوەندیا دناڤبەرا گەرمیێ وگوهۆڕینا کیمیایی.
- **پێکڤە گرێددەت** دناڤبەرا ڕەنگێ هندەك ماددا وجێگیریا وان یا کیمیایی.
- **بەحسکرنا** کارلێکان ب نڤێسینا هاوکێشێن زارەکی دکەت.

### پێشەکی

ئێك ژوان ڕێکا کو ب هاریکاریا وێ دزانی گوهۆڕینا کیمیایی ڕویدا تێبینی یە کو ڕەوشتێن ماددێن پەیدابووی دجودانە ژڕەوشتێن ماددێ یان ماددێن کارلێکری. ودبیت ماددێن نوی یێ پەیدابووی بگوهۆڕین بۆ ماددێ کارلێکری دکارلێکەکا کیمیایی یا دی دا. دڤێ تاقیکرنێ دا زنجیرەکا گوهۆڕینا دێ بینی دنتراتێ مسی (4) دا ڕویددەن دەمێ دزنجیرەکا کارلێکێن جودا دا دبوورن. ئەڤ هەمی کارلێکە دێ ڕویدەن دهەمان بۆریا تاقیکرنێ دا. ودهەر پێنگاڤەکێ دا دێ ل گرۆڤان گەڕی دیار بکەن کو ماددێ نوی پەیدابوو ژئەنجامێ گوهۆڕینا کیمیایی. هەروەسا دێ گوهۆڕین دگەرمیێدا بینی بەراورد کەی دگەل کارلێکێن کیمیایی.

### سلامەتی

**هەمی گاڤا بەرچاڤکێن پاراستنێ وبەرکۆشێ بکە بەرخۆ بۆ پاراستنا چاڤ وجلکێن خۆ.** ئەگەر ماددەکێ کیمیایی بەرچاڤێن تە کەفت ئێکسەر ب چاڤشوکی بشۆ ومامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بکە. جهێ دوشا تانا هاتنا تاقیگەهێ وچاڤ شیشتنێ بزانە وڕێکێن بکارئینانێ.

**دەست نەکە چ ماددێن کیمیایی.** هەکەر پیست یان جلکێن تە بەرکەڤتن بشۆ بئاڤا حەنەفیێ وئێکسەر گازی مامۆستایێ خۆ بکە. ئەسەح بە ژخاندنا زانیار ب نامێن هلاویستی و لدویڤ پێدڤیێن نیساندی ب وان ئامانێن بکاردئینی هەڕە. ئەگەر زانیاری نامە چ ئاگەهداری ل سەر نەبن شیرەتا ژمامۆستایێ خۆ بخازە کا پێتڤیە چ بکەی. تام نەکە چ ماددەکێ کیمیایی یان هەر تشتەکێ دتاقیگەهێدا بکاردهێت. هیچ جۆرەکێ ماددێن کیمیایی یێن زێدەبووی نە زڤڕینە ئامانێن وان، برێن کێم ماددان بینە ل دویڤ پێتڤیا تە دا بهەروە نەچیت.



**گازی مامۆستایێ خۆ بکە دەمێ هەر ماددەکێ کیمیایی بڕژیت.** پێتڤیە ماددێ ڕژتی پاقژ بکەی ل دویڤ ئاراستەکرنێن مامۆستای.

**دەمێ تو چرایێ بەنزن بکاردئینی، جلکێن فرهولە (شۆر) گرێبدە،** ودەمێ ئاگربەربوو جلکێن تە بەزە دوشا تانا هاتنا تاقیگەهێ وبکاربینە بۆ ئاگر ڤەمراندنێ، کەلوپەلێن شویشەی یێن شکەستی یان پیسبووی یان درزلێ گەرم نەکە، گاسکێ (مچینك) یان دەستگۆرکێن گەرمیێ بکاربینە بۆ گرتنا شویشێن گەرم وکەل وپەلێن دی.



**شویشێن شکەستی بهاڤێژە سەلکێن ئاساییدا: پێتڤیە بکەیە دسەلکێن تایبەتدا.**

## مادده وکەرەستێن هەر کۆمەکێ

- 1.0 M نیتراتی مس II
- 1.0 M HCl
- 1.0 M NaOH
- پەرداغ قەبارە 100 mL
- تیلەك درێژی 12 cm
- چراکێ بەنزن وتشتێن دگەلدا
- چیلکێ شیشەی
- خەلەکەکا ئاسنی
- پێنڤیسێ فێرکاری
- گرەیێ خەلەك (بازنەیی)
- راستە
- بۆریا تاقکرنێ (13 mm x 100 mm).
- هەلگرێ بوریێن تاقیکرنێ
- تۆرەکا کانزایی ناڤەند خەزەف

## رێکا کاری




شێوێ (أ)

شێوێ (ب)

**1.** 50 mL ئاڤێ بکە دپەرداغەکێ قەبارە 100 mL دا وگەرم بکە هەتا دکەلیت. ئەڤ گەرماڤا بکاردئینی دپێنگاڤا ( 5 ) دا.

**2.** هەتاکو گەرماڤ گەرم دبیت، پێنڤیس وڕاستەی بکاربینە بۆ وێنەکرنا سێ نیشانا لسەر بۆریا تاقیکرنێ دوراتیا 1 cm دناڤبەرێدا هەبیت دەست پێ بکە ژبنی بۆ سەری.

**3.** برا 1.0 M گیراوێ نتراتی مس (II) بکێ هەتا نیشانا ئێکێ هەر وەك دشێوێ (أ) دا دیارە.

**4.** برا 1.0 M گیراوێ هایدرۆکسیدی سۆدیۆم بکێ هەتا ئاستێ شلەی دگەهتە نیشانا دووێ هەر وەك دیار دشێوێ (ب) دا.

**ئاگەهداری**: **هایدرۆکسیدی سۆدیۆم ماددەکێ ژناڤبەرە. ئەسەح بە ژبەرچاڤکێن پاراستنێ وبەرکۆشە کربنە بەرخۆ، هشیاربە ژپیست وچاڤێن تە نەکەڤیت. ئەگەر ڤبەرکەت ئێکسەر ب ئاڤێ بشۆ ومامۆستایێ خۆیێ ئاگەهدار بکە.**

هەردوو گیراوا تێکەل بکە ب چیلکێ شیشەی و ب ئاڤێ بشۆ بەری دانیە سەر مێزێ. دەست بکە بنێ بۆریا تاقیکرنێ ژدەرڤە دا کو هەست ب گەرمیا پەیدابووی بکەی. ماددێ بەرهەم هاتی دبۆریا تاقیکرنێ دا هایدرۆکسیدی مس (II) ونیتراتی سۆدیۆمە. ئەو گوهۆڕینێن پەیدابووی ب جهێ دیاریکری دا تۆمار بکە.

**تێبینی**:

______________________________

______________________________

**5.** بۆریا تاقیکرنێ بکە دگەرماڤا ئاڤێدا ئەوا تە دپێنگاڤا (1) دا ئامادەکری (بەرهەمێ ڤێ کارلێکی ئۆکسیدی مس (II) وئاڤە) ئەو گوهۆڕینێن دبۆریا تاقیکرنێ دا پەیدادبن تۆمار بکە.

**تێبینی**:

______________________________

______________________________

**6.** بۆریا تاقیکرنێ ژگەرما ئاڤێ بینەدەر. چرایێ بەنزن ڤەمرینە. بۆریا تاقیکرنێ وناڤەرۆکا کێشێن وێ دهەوایێ ژووریدا بۆ ماوێ دوو خولەکا سار بکە. برەکا ترشێ هایدرۆ کلۆریك 1.0 M هەتا نیشانا سیێ بکە سەر. هەر وەك دشێوێ (ج) دا دیار.

**ئاگەهداری: ترشێ هایدرۆ کلۆریك ماددەکێ ژناڤبەرە ئەسەح بە تە بەرچاڤکێن پاراستنێ وبەرکۆشێ کربنە بەرخۆ. هشیاربە ماددە نەگەهیتە پیست وچاڤێن تە. هەروەسا هەلّما ماددەی نە هەلکێشی. ئەگەر هندەك ژڤی ماددەی ب تەدا ڕشت بلەز ئەو جهێ پێدا ڕشتی بشۆ ومامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بکە.**

ب چیلکێ شووشەی تێکەل بکە. چیلکی بشۆ بەری دانیە سەر مێزی. بەرهەمی نوی کلۆریدی مس II وئاڤە. ئەو گوهۆڕینا دبۆریا تاقیکرنێدا پەیدابووی تۆمار بکە.

ترشێ هایدرۆ کلۆریك

**شێوێ (ج)**

**تێبینی:**

---

---

**7.** تێلەکا ئەلەمنیۆمی دانە دبۆریا تاقیکرنێ دا هەتا کارلێك دراوەستیێت. دەست بکە بنێ بۆریێ ژدەرڤە دا کو ئەسەح بی ژپەیدابوونا گەرمیێ. ولڤێرێ دوو کارلێك دبن مس وکلۆریدی ئەلەمنیۆم پەیدا دبن. هەروەسا ئەلەمنیۆم کارلێکێ دگەل ترشێ هایدرۆکلۆریك دکەت بۆ پێکئینانا هایدرۆجینی وکلۆریدی ئەلەمنیۆم: ئەو گوهۆڕینێن دبۆریا تاقیکرنێ دا پەیدا دبن تۆمار بکە.

**تێبینی:**

---

---

---

**8.** تێلێ ژبۆریا تاقیکرنێ دا بینەدەر. مسێ پەیدابووی دگەل پارچەکا مسی ئەوێ دتاقیگەهێدا هەی بەراورد بکە.

**تێبینی:**

---

---

---

**پاقژکرن ورزگاربوون ژگلێشی**



**9.** هەمی کەرەستا وهەروەسا جهێ خۆ ل تاقیگەهێدا پاقژ بکە. کەرەستا ڤەگەڕینە جهێ وان. ماددێن کیمیایی وگیراوا پاڤێژە سەلکێن دیارکری. چ ماددەکێ کیمیایی نە ڕێژە یان نە هاڤێژە دسولین یان سەلکێن ئاسایێن گلێشی ئەگەر ب ڕازیبوونا مامۆستای نەبیت. دەستێن خۆ باش بشۆ بەری ژتاقیگەهێ دەرکەڤی وپشتی کار بدوماهی دهێت.

## پرسیار

1. **ڕێکخستنا هزرا**: ئەگەرێن گوهۆڕینا کیمیایی چنە؟

2. **ڕێکخستنا هزرا**: دوو هۆکارا بێژە کو ڕویدانا گوهۆڕینا کیمیایی نیشان بدەت. ئاماژە ب لایەنێن دیاریکری ژڤێ تاقیکرنێ بدە.

3. **زانیارییێن شیکاری**: هەمی ماددێن کارلێکری وبەرهەم هاتی دڤێ تاقیکرنێدا توخما ژئاوێتا جودا بکە.

4. **ڕێکین شیکاری**: چەوا کلۆریدێ ئەلەمنیۆم ژگیراوەی جودا دکەین؟

5. **ئەنجامێن نیشاندەر**: گیراوێن ئاوێتێن مسی چ ڕەنگن؟

6. **ئەنجامێن شیکاری**: کیژ ماددێن کارلێکری دتاقیکرنێدا شیانێن حەلیانێ هەنە دئاڤێدا؟ وکیژ وان شیانێن حەلیانێ نینن؟

7. **ڕێکخستنا ئەنجاما**: بزڤرە بۆ پێنگاڤێن ڕێکا کاری دتاقیکرنێدا وهاوکێشا زارەکی یا خوارنێ تەمام بکە.

أ. نیتراتی مس II + هایدرۆکسیدێ سۆدیۆم =

ب. هایدرۆکسیدی مسی II + گەرمی =

ج. ئۆکسیدی مسی II + ترشی هایدرۆکلۆریك =

د. کلۆریدی مسی II + ئەلەمنیۆم =

ه. ترشی هایدرۆ کلۆریك II + ئەلەمنیۆم =

## پرسیار

1. **زانیاریێن شیکاری**: چار گروڤا بێژە ڕویدانا گوهۆڕینا کیمیایی نیشاندددەن.

2. **هزرێن پەیوەندیدار**: گوهۆڕینا کیمیایی وەك بنجینەك بکاردهێت بۆ گوهۆڕینا ئاوێتەکی بۆ یێ دی بۆ دووبارە زڤراندنێ ( Recycling ). شرۆڤە بکە چەوا ئەڤ کارلێکێن دڤێ تاقیکرنێدا دیاربووین دشێن ب مفابن بۆ کریارا دووبارە زڤراندنا مسی.

3. **ئەنجامێن شیکاری**: بەحسێ باشی وخرابی یا دووبارە زڤراندنا توخمی بکە هەر وەك دڤێ تاقیکرنێدا کری.

ناڤ .................................... ڕۆژ .................................... پۆل ....................................

| تاقیکرن 4 | پاقژکرنا ئاڤێ |
|---|---|

## ئەنجامێن فێرکرنێ

پێناسا رەوشتێن کیمیایی وفیزیاییێن تێکەلەی دکەت.
- دئێخیتە دخزمەتێ دا رەوشتێن کیمیایی وفیزیاییێن تێکەلەی دکریارا پاقژکرنێدا.
- بەراورد دکەت رێکا یان تەکنێکێن جودا بۆ پاقژکرنا تێکەلی.

## مادده وکەرەستێن هەر کۆمەلەکێ

- رەژیا چالاك (چارکۆل)
- چراپەکێ دەستی یان نیشاندەرێ سلایدا دگەل شاشەکا نیشاندانێ
- نموونەك ژ ئاڤا شێلی 3 mL
- راستەك یان دەپەکێ پلەکری
- کۆڤەکەکا بچووکا لوولی درێژ (هژمار 2)
- مژۆکا زراڤ (هژمار 2)
- کەڤچکەکێ پلاستیکی
- خیز
- پالدەرێ (مضخة) پلاستیکی یا ئێمن
- سەفینك
- هەلگرێ بۆرێن تاقیکرنێ
- بۆرێن تاقیکرنێ (هژمار 4)
- دەستە مالێن کاغزێ
- سێنیەك یان تەبەقەکا مەزن
- تێلە 12 cm یان پیڤانە 10 یان 12.

## پێشەکی



کێم مادده پاقژ هەنە دسروشتیدا، ژبەر هندێ پێتڤیە تێکەلا ژێك جودا کەین وەك خاڤێن کانزا ونەفتێ دئاڤا پاقژدا پاقژبن. بۆ ئەنجامدانا ڤێ پێتڤی زنجیرەکا پێنگاڤانە بۆ ژێگرتنا خلتا ژتێکەلی. زانینا پێش وەخت یا رەوشتێن کیمیایی وفیزیاییێن ڤان خلتا پێتڤیە بۆ دانانا پلانەکا کریار بۆ جوداکرنێ.
دڤێ تاقیکرنێدا نموونەکا ئاڤا شێلی دێ هێتە پاقژکرن ب بکارئینانا پێنگاڤێن ل خوارێ: جوداکرنا ئاڤێ ژرۆنی ب نیشاندانێ دگەل بکارئینانا کوڤکا جوداکرنێ، وپالاوتن ب خیزی بۆ ژێگرتنا ماددێن هەلاویستی، دروومژین ب رەژیا چالاك بۆ ژێگرتنا خلتا. ئەڤ هەرسێ رێکە دسروشتێ خۆدا وەك وان رێکانە ئەوێن دژیانا رۆژانەدا بکاردئینین، دهندەك مالاندا ئاڤێ دپالێوکا دا دبەن کو رەژیا چالاك تێدایە بۆ ژێگرتنا خلتا دبیتە ئەگەرێ بێهن وتامەکا نەحەز (غیر مستساغین). ئارمانجێ تە ژڤێ تاقیکرنێ، پاقژکرنا نموونەکا ئاڤێیە گەلەك خلتە تێدانە وزۆرترین برا ئاڤا پاقژ ژڤێ نموونێ بگری.

## سلامەتی

**بەردەوام بەرچاڤکێن پاراستنێ وبەرکۆشێ بۆ پاراستنا چاڤ وجلکێن خۆ بکە بەرخۆ.** ئەگەر چاڤێن تە بەر ماددەکێ کیمیایی بوو، بشۆ ل جهێ چاڤ شیشتنێ دتاقیگەهێ دا. ئێکسەر داخازا مامۆستایی بکە. جهێ تانا هاتنێ وچاڤ شیشتن ورێکێن بکارئینانا وێ بزانە.

**دەست نەکە چ ماددەکێ کیمیایی ئەگەر دەستێ تە یان جلکێن تە بەرکەڤتن بشۆ و مامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بکە.** پشتڕاستبە ژخاندن وتێگەهشتنا ڕێنمایان وپێزانینێن زانیار ب نامێن هەلاویستی. ڕێنماییێن لسەر ئامانێن ماددێن کیمیایی بکاربینە. وئەگەر ڕێنمایی لسەر نەبن. پرسیارا مامۆستای بکە کا دێ چ کەی. تام نەکە چ ماددەکێ کیمیایی یێن ل تاقیگەهێدا بکاردهێت و چ ماددەکێ بکارئینایی نە ڤەگەڕینە بۆ ئامانێ وی. وبرێن کێم بکاربینە دا ب هەروەیی نەچیت.

**مامۆستایێ خۆ ل دەمێ ڕشتن وریکرنێ ئاگەهدار بکە،** دڤێت ئێکسەر جهێ ماددێ ڕشتی باش پاقژ بکەی لدویڤ شیرەتێن مامۆستایی.

## ئامادەکاری

خشتەکێ زانیاریا هەر وەك ئەوێ ل حواری لاپەڕی دبینی ئامادە بکە وبۆشاییێ بۆ شەش تێبینیا بەرهەڤ بکە بۆ هەر ئێك ژچوار قۆناغێن پاقژکرنێ: بەری چارەکرنێ، پشتی جوداکرنا تێکەلێ ئاڤ وزەیتێ، پشتی پالاوتنێ ب خیزی، پشتی ڕوومژینێ ب ڕەژیێ. هەر شەش تێبینی ئەڤەنە: ڕەنگ، ڕوونبوون (نەهێلانا شێلییێ)، بێهن، قەبارە، هەبوونا زەیتێ، دبیت ماددێن ڕەق هەبن.

## ڕێکا کاری

**1.** بۆریەکا تاقیکرنێ پرکە ژنموونەکێ ئاڤا شێلی، وخشتەیێ زانیاریا بەرهەڤکە بۆ تۆمارکرنا تێبینیا. ڕاستەکێ پلەدار ژمامۆستایی وەرگرە. بۆریا تاقیکرنێ لسەر هەلگرەکێ دەپی ب شێوەکێ ستونی لسەر مێزا تاقیگەهێ جێگیر بکە ب ڕەخ ڕاستەیێ پلەدارڤە. پاشی قەبارەی تێزیکی دەهێکا (0.1) ملیمەترێ بپیڤە، هەروەك دشێوێ (أ) دا دیار.

**2.** چار بۆرێن تاقیکرنێ یێن هشك لسەر هەلگرێ دەپی جێگیر بکە، مژۆکەکا زراڤ بۆ ڕاکێشانا هەمی ئاڤا شێلی بکاربینە وئاڤا شێلی بکە دپالدەرا ژێك جوداکرنێ. دەڤێ پالدەرێ ژێك جوداکرنێ سەر نشیڤ بکە وبزڤینە سەر دەڤێ بۆریا تاقیکرنا ئێکێ. هەر وەك دیار دشێوێ (ب) دا دلاپەڕێ بێت دا. ڕووگرژی پارێزگاریا شلەی ژڕشتنێ بۆ دەرڤە دکەت. بۆ دەمەکی پالدەری بهێلە جێگیربیت هەتا دوو چینێن شلەی لسەر تەنوکێن نیشتی پەیدابن ب شێوێ چینا ل بنێ پالدەری.

**3.** هێدی دلۆپەك یان دووان ژنیشتوو بکە دبۆریا تاقیکرنێ یا ئێکێدا پاشی چینا ئاڤێ دبۆریا دووێ دا ب ڕێژە، بەلێ هشیاربی چینا زەیتێ ل سەرێ پالدەری نە ڕێژی. دوماهیێ چینا زەیتێ یا مای دبۆریا تاقیکرنێ یا ئێکێ ب ڕێژە.

| خشتەیێ زانیاریا | بەری چارەکرنێ | پشتی ژێك جوداکرنا ئاڤێ – زەیت ب کریارا نیشتنێ | پشتی پالاوتنێ ب خیزی | پشتی ڕوومژینێ ب ڕەژیا چالاك |
|---|---|---|---|---|
| ڕەنگ | | | | |
| ڕوونبوون (نەمانا شێلیێ) | | | | |
| بێهن | | | | |
| قەبارە | | | | |
| هەبوونا زەیتێ | | | | |
| هەبوونا ماددێن ڕەق | | | | |




**شێوێ (أ)** بلندیا ئاڤێ دبۆریا تاقیکرنێ دا پیڤەرێ قەبارێ ڕێژەیێ ئاڤێیە.




**شێوێ (ب)** مژۆکەکا زراف بکاربینە بۆ ڤەگوهاستنا نموونەکا ئاڤێ شێلی بۆ ترۆمپا ژێك جوداکرنێ. پاشی چینەکا نیشتووی ڤالا بکە دبۆریا تاقیکرنا ئێکێدا.

**4.** سەحکە ساخلەتێن ئاڤێ دبۆریا تاقیکرنێ یا دووێ دا پشتی ژێك جوداکرنا ئاڤ – زەیت ب نیشاندنێ، پاشی قەبارێ ئاڤێ دبۆرییێدا بپیڤە. ڤان زانیاریا دخشتەی دا تۆمار بکە. ونموونا ئاڤێ دبۆریا تاقیکرنێ یا دووێ دا دانە لایەکی.

**5.** کەڤچکەکێ خیزی بکە دسەفینکیدا دا بۆ دەمێ 15 چرکا لسەر سینیەکا پلاستیکی بهەژینە.

**6.** خیزێ گر (ئەوێ دسەفینکیدا مای) وخیزێ هویر (ئەوێ کەفتیە دسینییێ دا) بشێوێ چینا بکە دنیڤا بنی یا کۆڤکەکا بچووکا لویلی درێژ هەر وەك دشێوێ (ج) دا دیار.

**7.** کۆڤکا بچووك دانە سەر بۆریا تاقیکرنێ یا سییێ ونموونەکا ئاڤا بدەست تە کەفتی دپێنگاڤا 4 دا برێژە تێدا. دوماهیا کریارا پالاوتنێ دا کۆڤکێ ڕاکە پشتی پتریا برا ئاڤێ ژێ هاتیە خوارێ.

**8.** پشتی نموونا ئاڤێ ب خیزی پالاوتی سەحکە ساخلەتێن وێ وقەبارێ وێ بپیڤە، پاشی ڤان زانیاریا دخشتەیدا تۆمار بکە. نموونا ئاڤا دبۆریا تاقیکرنا سییێ دانە لایەکی وهەلبگرە.

**9.** پارچەکا ب قەبارێ سەد دیناری ژدەستمالەکا کاغەزێ ببڕە بادە وبکە فەتیلە وبکە دناڤ کۆڤکا دی یا بچووکا لویلی درێژدا. تێلەکێ بکاربینە بۆ حەشاندنا دەستمالێ دلویلیا کۆڤکا تیژ دا (المدببة). پاشی نیڤا خواری یا لویلییێ پڕکە ژڕەژییێ. هەر وەك دشێوێ (د) دا دلاپەڕێ بێت دا. کۆڤکێ دانە سەر بۆریا تاقیکرنێ یا چوارێ.

**10.** ئاڤا دبۆریا تاقیکرنێ یا سیێ دا ب هشیاری بکە دناڤ کۆفکێ دا، وبهێلە ئاڤ بێتە پالاوتن (تێبینی: دا کو کریارا پالاوتنێ بلەز بیت، پەستانێ لسەر ئاڤێ زێدەکە ب دانانا تبلا بەرانی لسەر دەڤێ سەری یێ کۆڤکێ وهێدی پەستانێ بێخە سەر لایێن پالدەرێ برێ، هەر وەك دشێوێ (د) دا دیارە. ئەڤ کریارە دێ هاریکاریا پالدانا شلەی کەت دناڤ ڕەژی ودەستمالا کاغەزێدا.

**11.** ل دویماهیا کریارا پالاوتنێ ب ڕەژیێ سەحکە ڕەوشتێن نموونێ وقەبارێ دویماهیێ بپیڤە. ڤان زانیاریا دخشتەیدا تۆمار بکە. نموونا ئاڤا پاقژکری نیشا مامۆستاییێ خۆ بدە.

## پاقژکرن وڕزگاربوون ژپاشەڕۆیان

**12.** بۆ ڤەگەڕاندنا خیزی، کۆڤکا پالاوتن ب خیزی سەرنشیڤکە سەر ئامانێ کۆمکرنا خیزی، پەستانێ دانە سەر گوپیتکێ ولێڤێ دناڤ تبلێن خۆدا ب لڤینە. کۆڤکا بچووك بۆ پالدانا ئاڤێ دناڤ کونێدا پاشی ب ئاڤێ بشۆ دا کو خیز دەرکەڤیت بۆ ئامانی.

**13.** بۆ ڤەگەڕاندنا ڕەژیێ، گوپیتکا مژۆکێ کونکە وتێکەلێ بکاربینە بۆ پالدانا هەمی ئەو ڕەژیا مای بۆ ئامانێ کۆمکرنا ڕەژیێ.

**شێوێ (چ)** کۆڤکەکا بچووك بۆ پالاوتنێ ب خیزی بەرهەڤ بکە ب دانانا چینەکا خیزێ هیر دناڤبەرا دوو چینێن خیزێ گردا.

**14.** بەرمایکێن زەیتێ لسەر کەرەستا ب دەستمالا کاغەزێ نەهێلە ودەستمالێ پاڤێژە دسەلکا گلێشی دا.

**15.** بەرمایکێن ئاڤا شێلێ وزەیتێ وشلێن دی ب دەستمالا کاغەزێ نەهێلە ودەستمالێ پاڤێژە دسەلکا گلێشیدا.

**16.** ئاڤا پاقژکری برێژە دەستشوییێ. جهێ خۆ پاقژکە دتاقیگەهێدا وهەمی کەرەستێن تاقیکرنێ وبزڤڕینە دجهێ وان دا. خۆ ژماددێن کیمیایی وگیراوا ڕزگار دکەت ئامانێن تایبەتدا یێن مامۆستای دیار کرین. چ ماددێن کیمیایی نە ڕێژە دەستشوییێ ونە هاڤێژە دسەلکا گلێشیدا ئەگەر مامۆستایی نە گوتبیت. پاشی دەستێن خۆ بشۆ پاشی تو کارێ خۆ تەمام دکەی وبەری تو ژتاقیگەهێ دەردکەڤی.

## شرۆڤەکرنا ئەنجامان ولێکدانا وان

1. **شرۆڤەکرنا ڕێکا:** بکارئینانا تە بۆ ڕاستەی دیڤانا قەبارێ شلەی دبۆریا تاقیکرنێ دا، تە چ گریما دانا لسەر بۆریا تاقیکرنێ.
2. **شرۆڤەکرنا ڕێکا:** ئارمانج ب دانانا خیزێ گر دبنێ کۆڤکێ دا ودانانا خیزێ هیر دنیڤا کۆڤکێدا چ بوو؟ ئارمانج ب دانانا خیزێ گر ل سەرێ کۆڤکێ دا چ بوو؟
3. **شرۆڤەکرنا ڕێکا:** چونکو ڕەژی گونجاوترین کار ئەنجام ددەت بۆ لابرنا خەلتێن بچووك ژئاڤێ، بۆچی ل پێشیێ تە بکارنەئینا و ل سەر هەمی پێنگاڤێن دی بازدابا؟
4. **شرۆڤەکرنا ڕێکا:** تە بۆچی بۆرێین تاقیکرنێ یێن پاقژ بکارئینان دا نموونەیێ بکەیە تێدا پشتی هەر کریارەکا پاقژکرنێ؟




**شێوێ (د)** تبلا بەرانی دانە سەر دەڤێ سەر یێ کۆڤکا بچووك وهێدی پەستانێ بکە سەر لایا. ئەڤ کریارە دێ کریارا ڕوومژین وپالاوتنێ بلەز ئێخیت.

## دەرئەنجام

1. **پەیوەندیێن بەلگەپێدای**: ئەڤێن دهێن بەرەڤ ژور ل دویڤ چرِیا وان رِێزبکە: ئاڤ، هەلْواسراوێن نیشتوو، رِۆن، چەوا دڤێ تاقیکرنێ دا رِێنیشانێ تەکر بۆ ڤێ رِێزبوونێ.

2. **دەرئەنجامێن بەلگەپێدای**: کیژ مەزنترن، تەنوکێن هەلْواسراو (هەلاویستی) ئەوێن ئاڤ وەك مژێ لێکری (ل شینا یا رِوون بیت) یان ئەوێن ئاڤ رِەنگین کرین کری (بەلێ رِوون)؟ ئەگەرێ لێکبدە.

3. **هەلْسەنگاندنا رِێیان**: رِێژەیا سەدی ئاڤا ڤەگەرِاندی ب بکارئینانا ئەڤێ هاوکێشا ل خوارێ دیار بکە.

$$\text{رِێژەیا سەدی ئاڤا ڤەگەرِاندی} = \frac{\text{قەبارێ ئاڤا پاقژکری}}{\text{قەبارێ نموونەیا بنەرِەت}} \times 100$$

4. **هەلْسەنگاندنا رِێیان**: ئەنجامێ خۆ دگەل کۆمەلێن دی بەراورد بکە پێتڤیە چەوا تەکنیکێن کۆمەلێن سەرکەفتی بکارئینای هەلْسەنگێن؟

## سەربار

1. **دارێژتنا تاقیکرنا**: چەوا دێ رِێژەیا سەدی یا ئاڤا ڤەگەرِاندی یان پاقژیا ڤێ ئاڤێ باشترکەی؟ ئەگەر مامۆستا دگەل پێشنیارا تە بوو، هزرێن خۆ تاقیبکە ل سەر نموونەیەکا دی یا ئاڤا شێلی.

2. **بجهئینانا هزرا**: دویڤچوونا چەوانیا پاقژکرنا ئاڤێ ل باژێرێ خۆ بکە. ئەو خلْتەیێ بەربەلاڤ دئاڤێدا چییە؟ وئەو پێنگاڤێن بۆ جوداکرنا خلْتەیا ژئاڤێ چنە؟ رِاپۆرتەکێ بنڤێسە ڤان کریارا تێدا دیار بکە.

3. **شیکرنا هزرا**: دپێنگاڤا نیشتنێ دا رِەق جوداکرن ژشلەی چونکو ئێك ژوان چرِی پترە ژئەوێ دی. دکریارا دلۆپاندنێدا distillation، تێکەل هێدی دهێتە گەرم کرن هەتا ئێك ژپێکهێنەرێن وی دگەهیتە پلەیا کۆلانێ ودگوهۆرِیت بۆ گازێ. چەوانیا بکارئینانا دلۆپاندنێ بۆ ژێك جوداکرنا تێکەلەکی پێك دهێت ژدوو شلەیا کو پلەیا کۆلانا وان ژێك جودایە.

ناڤ ............ ڕۆژ ............ پۆل ............

## تاقیکرن 5 جوداکرنا تێکەلەی

### ئەنجامێن فێرکاری

- **پێناسا** ساخلەتێن کیمیایی وفیزیاییێن تێکەلی دکەت.
- **دەستنیشان دکەت** ساخلەتێن کیمیایی وفیزیایی دکرارا پاقژکرنا تێکەلی دکەت.
- **دارێژتنا** تاقیکرنێ بۆ جوداکرنا پێکهێنەرێن تێکەلی دکەت.
- **هەلسەنگاندن** ڕادەیا سەرکەفتنا ڕێکێن پاقژکرنێ (پۆختەکرنێ) دکەت.

### مادده وکەرەستێن هەر کۆمەلەکێ

- کاغەزا ئەلەمنیۆمی
- گوکێن پەمبی
- ئاڤا دلۆپاندی
- کۆڤکا پالاوتنێ
- کاغەزا پالاوتنێ
- مچینك
- موگناتیس
- دەستمالێن کاغەزی
- شویشا دەمژمێری
- چەتەلێ پلاستیکی
- کەڤچکێن پلاستیکی
- مژۆکا ڤەخوارنێن گازی یا پلاستیکی
- مژۆك
- نموونەکا تێکەلی ژ خیزی وهیرکێ ئاسنی وخوێ ودندکێن برنجی
- بۆرێن تاقیکرنێ
- دەمبوسێن کاغەزی
- چیلکێن دارێ
- شریتا نیسەکا ڕوون (شفاف)

### پێشەکی



شیانا ژێك جوداکرنا پێکهاتێن تێکەلەی دا کو پاقژ بیت، ژکارێن گرنگە دپیشەسازی وڤەکۆلینێن زانستی دا. کیمیاگەر دکارێن خۆ ادپێتڤی ماددێن کیمیایی یێن پاقژن، بەلێ ماددێن کیمیایی دسروشتیدا گەلەك کێم ب پاقژی هەنە. جوداهیا درەوشتێن فیزیاییێن پێکهاتەیێن تێکەلەی دبیتە ئەگەرێ بکارئینانا شێوازێن جودا بۆ ژێك جوداکرنێ. دڤێ تاقیکرنێدا دەلیڤە بۆ تە پەیدا دبیت بۆ دارێشتن وپەرەپێدان ولێکدانا ڕێکا تایبەتا خۆ بۆ جوداکرنا تێکەلەی. ئەو تێکەلێ تو تاقیکرنا خۆ لسەر دکەی پێك دهێت ژ خیزی وخوێ وهیرکێ ئاسنی ودندکێن برنجی. کو هەر چوار دهشکن وشێوێ دندکا دانە.

### سلامەتی



**هەمی گاڤا ب بەرچاڤکێن پاراستنێ وبەرکۆشێ بکە بەرخۆ بۆپاراستنا چاڤ وجلکێن خۆ.** ئەگەر چاڤێن تە ماددەکێ کیمیایی بەرکەفت ئێکسەر ب چاڤشۆی بشۆ ومامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بکە. جهێ دوشا تانێ هاتنێ، وچاڤ شویشتنێ وڕێکا بکارئینانا واں بزانە.

**هەر ماددەیەك ب ڕژیت گازی مامۆستایێ خۆ بکە. دڤێت ئێکسەر ماددێ ڕشتی پاقژ بکەی ل دویڤ شیرەتێن مامۆستایی.**

## ئامادەكرن

كارێ تە دێ دیاریكری بیت ب پلاندنان وبجهئینانا تاقیكرنا ژێك جوداكرنا پێكهێنێن تێكەلەی. پێش كریارا پلاندانانێ، دێ پێتڤی زانینا رەوشتێن هەر ئێك ژپێكهێنێن تێكەلەی بی. وڤان رەوشتان دێ بكارئینی بۆ دارشتنا تاقیكرنا ژێك جوداكرنا. خشتەیێ زانیاریا ددەفترا تێبینیێن خۆدا بنڤیسە وبۆ تۆماركرنا تێبینیا بكاربینە.

## رێكا كاری

**1.** نموونەیێن جودا ژهەر ئێك ژچار پێكهێنێن تێكەلەی ژمامۆستایێ خۆ وەربگرە. ئەو كەرەستێن بەردەستدا بكاربینە بۆ پشكنین ودیاریكرنا رەوشتێن وان. دێ پێتڤی چەند تاقیكرنا بی بۆ هەر ماددەكی، ژبەر هندێ هەمی نموونێ دتاقیكرنا ئێكێدا بكارنەئینە. پشكنینا ماددا بكە دا بزانی ئەگەر موگناتیسی یا شیانا توانەوە یان سەر ئاڤ دكەڤن. تێبینیا دخشتەیێ زانیاریا دا تۆمار بكە.

**2.** پلانەكێ دانە بۆ وی كارێ تو دێ كەی بۆ ژێك جوداكرنا وی تێكەلێ چوار پێكهاتە تێدا ئەوی ل پێنگاڤا **1** دا بەحس كری وپێداچوونا پلانا خۆ بكە دگەل مامۆستایێ خۆ.

**3.** نموونەكێ بدەستخۆڤە بینە ژتێكەلەی ژمامۆستایێ خۆ، كەرەستێن بەر دەست بكاربینە بۆ بجهئینانا رێكا ژێك جوداكرنێ ئەوا تە پشت پێ بەستی.

## پاقژكرن ورزگاربوون ژپاشمایان



**4.** جهێ كاری وهەمی كەرەستێن دتاقیكرنێ دا بكارئینایین دڤەگەرینە جهێ وان. خۆ ژكیمیایێ وگیراوا رزگاركە وبكە دسەلكێن مامۆستایی بۆ دیاركرین. هەر ماددەكێ كیمیایی نە رژە ددەستشۆیێ دا ونە هاڤێژە دسەلكا گلێشیدا ئەگەر مامۆستایی نە گوتبیت. دەستێن خۆ باش بشۆ پشتی تو دوماهیا كاری وبەری تو ژتاقیگەهێ دەردكەڤی.

## شیكرنا ئەنجامان ولێكدانا وان

**1. رێكا هەلسەنگاندنێ:** پێڤەرەكێ ژ ( **1** بۆ **10** ) بكاربینە بۆ هەلسەنگاندنا راددەیا سەركەفتنا خۆ دژێك جوداكرنا وڤەگەراندنا هەر چار پێكهاتێن تێكەلەی. پێڤەرێ **1** دانە باشترین و **10** یا خرابترین. ئاستێ هەلسەنگاندنێ لێكبدە ل دویڤ وان تێبینیێن ب دەست تە كەفتین.

**1. رێكا هەلسەنگاندنێ:** هەلسەنگاندنا تە بۆ پێنگاڤێن رێكا كاری یا پالپشتكری چییە؟

**2. دارێژتنا تاقیكرنا:** ئەگەر دەلیڤا دووبارەكرنا تاقیكرنێ تە هەبیت، چ پێنگاڤا دا گوهۆری؟ بۆچی؟ پێنگاڤێن نوی بنڤێسە.

## دەرئەنجام

**3. دارێژتنا تاقیكرنا:** دوو ماددا یا دوو كەرەستا پێشنیار بكە بەردەست نەبن، وئەگەر بەردەست بن دا كریارا ژێك جوداكرنێ ب ساناهی بیت.

**4. بجهئینانا هزرا:** رەوشتەكێ فیزیایی جیاكەر بۆ هەر ئێك ژچار پێكهاتەیا دیار بكە هاریكاریا تە كربیت بۆ ژێك جوداكرنێ ژپێكهاتێن دیێن تێكەلەی.

| خشتێ زانیاریا | | | | |
|---|---|---|---|---|
| رەوشت / ماددە | خیز | هیركێ ئاسنی | خوێ | دندكێن برنجی |
| توانەوە | | | | |
| سەرئاڤ كەفتن | | | | |
| موگناتیسی | | | | |
| یێن دی | | | | |

## سەربار

**1. رێکێن هەڵسەنگاندنێ**: چ رێکن دشێین بکاربینین بۆ دەستنیشانکرنا خاوێنیا هەر ئێك ژپێکهاتەیێن ژێك جوداکرین؟

**2. دارێژتنا تاقیکرنا**: چەوا دشێی هەر ئێك ژپێکهاتەیێن تێکەڵێن دووانی یێن خوارێ ژێك جودا بکەی.

أ. هیرکێ ئاسنی وهیرکێ قۆرقۆشمی.

ب. خیز وبەرە شیشك.

ج. خیز وهیرکێن زۆر بچووکێن پۆلیسترین Polystrenefoam. (تەپەدورێ (فلینێ) دەستکرد).

د. خوێ وشەکر.

ه. کحول وئاڤ.

و. نایترۆجین وئۆکسجین.

ناڤ .................................. رۆژ ..................... پۆل ..................................

# تاقیکرنا 6 هویری ودابنین کاری دپیڤانێ دا

## ئەنجامێن زانستی

- پیڤانێن تاقیکری دژماره كارێدا **بكاردئینن**.
- كۆمكرنا پێزانینان ورێكخستن دخشتی دا دكەت.
- بهایێ ناڤەندی دهێتە هژمارتن ژكۆمەڵەكا پێزانینا، وئەڤ بهایە دهێتە بكارئینان بۆ هژمارتنا لادانا تەواو ولادانا ناڤەند.
- زانینێ دكەت بۆ گرنگی دهویری ودابین كارییێ دا دپیڤانێن زانستی دا.
- گرێدان زانیارییێن تاقیكرنێ یێن باوەر بێ كری ب لادانا پەتی Absolute deviation، وناڤەند لادان average deviation، ونە ئـەسەح بـوون uncertainty، ورێژا سەدی یـا شاشییـێ percentage error.

## پێشەكی

دڤێ تاقیكرنێ دا قەبارێ شلەیەكی ب دوو رێكێن جودا جودا دیار بكەین وئەنجامان بەراورد بكەین، وهەروەسا دیاركرنا چرپا كانزایەكی بكارئینانا پیڤانێن تە یێن بارستایی وقەبارەی.

$$D = \frac{m}{V}$$

بەراوردكرنا ئەنجامێن تە دگەل بهایێن پەسەندكری دژێدەران دا هەین، ودیاركرنا شاشییێ ورێژا سەدی یا شاشییێ دهەر پشكەكێ ژتاقیكرنێ دا.

experimental error دیاری دەكرێت بەلێ ژێربرنا بهایێ پیڤای experimental value لە بهایێ پەسەندكری accepted value رێژا سەدی یا شاشییێ لدویف ڤێ هاوكێشی دئیننە دەری.

$$\text{رێژا سەدی یا شاشییێ} = \frac{\text{بهایێ پەسەندكری} - \text{بهایێ پیڤای}}{\text{بهایێ پەسەندكری}} \times 100$$

دێ نیشانا شاشیا تاقیكرنێ ورێژا سەدی یا شاشییێ یان موجەبە (دەمێ ئەنجامێن تاقیكرنێ گەلەك بلندبن) یان سالبە (دەمێ ئەنجامێن تاقیكرنێ گەلەك نزم بن). دێ نیڤا بهایێ چرپا كانزایەكێ ئیننەدەر ژوان بهایێن كو ب دەست قوتابییێن دی كەڤتین. دڤێ نیڤانێ دا دێ نیڤا لادانێ ژڤان زانیاریان دیار كەین وئەڤ نیڤە دێ دەربرینێ كەت كو پیڤەرەكێ گومانێ یە یان نە ئەسەح بوون ژپیڤانێ.

## سلامەتی

**بەرچاڤكێن پاراستنێ دانە بەر چاڤێن خۆ وبەركۆشێ تاقیگەهێ هەردەم بكە بەرخۆ بۆ پاراستنا چاڤ وجل وبەرگێن تە**، ئەگەر ماددەیەكێ كیمیایی ب چاڤێن تە كەفت تە ئێكسەر ب چاڤشوی چاڤێن خۆ بشۆ ومامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بكە، فێری جهێ تانا هاتنا دەستپێكێ ل تاقیگەهێ ببە وجهێ شویشتنا چاڤا ورێكێن بكارئینانا وان بزانە.

**دەستت نەكە چ ماددێن كیمیایی**. ئەگەر پیست یان جلكێن تە بەر ماددەیەكێ كیمیایی كەت ئـێكسەر دحـەوزا شوشتـنـێ دا بشۆ، ومـامـۆستـایـێ خـۆ ئـاگـەهـدار بكـە، پشتراستبە ژزانیارییێن ب دەڤەرێن ماددەیێن كیمیای ڤە، وپێگیری كرن ب نیشاندەرێن ل سەر دەڤەرێن

ماددێن کیمیاییێن کو بکاردئێت، وئەگەر لیستا زانیاریان ل سەر مەترسیێن ماددێن کیمیایی نەبن مامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بکە ولدویڤ رێنمایێن نیشاندەرێن مامۆستایێ خۆ هەرە، ماددەیێن کیمیایی یێن زێدە نە ڤەگێرە دەفرێن واتێن بنەرەت، وبرێن کێم بکاربینە دا پەلاچە نەبیت.



**شوشێن شکەستی نەکە دسەلکێن بەرمایکێن ئاسایی دا.** پێدڤیە ژ شوشێن شکەستی رزگاربین ب داناناوا دئامانەکێ جودا دا لدویڤ شیرەتێن مامۆستایێ خۆ.

## ماددە وکەرەستێن هەر کۆمەکێ

- راستەیەکێ پلاستیکی درێژیا وی 15 cm
- لولەکا پلەکری قەبارا وێ 25 mL
- ئامانەکێ قەبارە 100 mL
- تەرازی
- هویرکێ کانزایەکی (ئەلەمنیۆم، مس، یان قۆرقۆشم).
- گەرمپیڤەکێ بێ جیوە

## رێکا کاری

**تۆمارکرنا تێبینیان:** پشتی تەمامکرنا هەر پشکەکێ ژتاقیکرنێ، تێبینێن خۆ دخشتێ زانیاریێن گونجای دا تۆمار بکە، چونکو تۆمارکرنا زانیاریان ل هەر جهەکێ دی دێ بهایێ نە هویریێ زێدە بیت.

### پشکا 1

**1.** لێنێرینا پلەکرنا سەنتیمەتری یا راستەیێ پلاستیکی بکە. بچویکترین پلە چیە؟

---

هەتا کیژ پشکێ ژسەنتیمەتری دێ شێی ب ڤێ راستەیێ ب پیڤی؟

---

**2.** راستەیەکێ بکاربینە بۆ پیڤانا تیرێ ناڤەندی یێ لولەکا پلەدار (قەبارە100 mL). هەر ب وی رێکێ درێژیا ناڤوکی یێ لولەکێ پلەدار بپیڤە هەتا پلا (50 mL). ڤان پیڤانان دخشتێ زانیاریان 1 دا تۆمار بکە.

| خشتێ زانیاریێن 1 | |
|---|---|
| تیرێ ناڤوکی یێ لولەکا پلەدار | |
| بلندیا ناڤوکی یێ لولەکا پلەدار | |

### پشکا 2

**3.** لێنێرینا پلەکرنا گرامی یا تەرازیێ بکە، بچویکترین پلەکرن چیە؟

---

هەتا کیژ پشکێ ژگرامی دێ شێی ب تەرازیا سەنتیمەتری بپیڤی؟

---

4. پلەیێن ل سەر لولەکەکا پلەدارکری قەبارە 25 mL ب پشکنینە وبچویکترین پشك ژ mL کە تو بشێی بپیڤی دیار بکە، ئەرێ ئەڤ پشکە دگەل پیڤانا گومانکری ئەوا دبکارئینانا لولەکا پلەدارا قەبارە 100 mL دا دەست مە کەفتی رێك دکەڤن؟

___

___

___

___

5. بکارئینانا تەرازیێ، بارستا لولەکا پلەدارا قەبارە 25 mL دیاربکە، پیڤانێ دخشتێ زانیارێێن 2 دا تۆمار بکە.

6. پەرداخەکێ هەتا نیڤی تەژی ئاڤ بکە وپلا گەرمیا ئاڤێ بۆ نێزیکترین بەهایێ چرپا ئاڤێ دوێ پلا گەرمیێ دا لێبگەرە ودیار بکە پاشی دبەهایێ پلا گەرمیێ وچرپا ئاڤێ دخشتێ زانیاریاندا تۆمار بکە.

7. ئاڤێ بکە لولەکەکا پلەدار هەتا ئاستێ دناڤبەرا 10 mL و 25 mL، ب هویری قەبارەی بخوینە وتۆمار بکە، بارستایێ ئاڤێ دگەل بارستایێ لولەکا پلەدار دیار بکە، وڤان بەهایان دخشتێ زانیاریانێ 2 دا تۆمار بکە، ئاڤێ دلولەکا پلەدارکری دا هەلبگرە دا دپشکا 3 دا بکاربینی.

| خشتێ زانیاریان 2 | |
|---|---|
| بارستا لولەکا پلەدارکری ب ڤالاهی | |
| پلا گەرمیا ئاڤێ | |
| چرپا ئاڤێ | |
| قەبارێ ئاڤێ | |
| بارستایێ لولەکا پلەدار + بارستایێ ئاڤێ | |

## پشکا 3

8. برەکا دیارکری ژهویرکێ کانزایەکێ دیارکری (ئەلەمنیوم، مس، قۆرقوشم) بکە دلولەکا ئاڤ تێدا (ئەوا هاتیە هەلگرتن دپشکا 2 دا) هەتا قەبارێ ئاڤێ ب برا 5 mL ب کێماتی بلند ببیت، قەبارەی پشتی بلندبوونێ دیار بکە پاشی بارستایێ هویرکێ کانزای وئاڤێ ولولەکێ دیار بکە. پیڤانێن خۆ دخشتێ زانیارێێن 3 دا تۆمار بکە.

| خشتێ زانیاریان 3 | |
|---|---|
| قەبارێ ئاڤێ (ژپشکا 2) | |
| بارستایێ ئاڤێ + لولەکا پلەدار 2 | |
| قەبارێ هویرکێ کانزای وئاڤێ | |
| بارستایێ هویرکێ کانزای+ئاڤ+لولەکا پلەدار | |

## پاقژکرن وڕزگاربوون ژبەرمایکان



9.کەرەستا وجهێ کارێ تە ل تاقیگەهێ پاقژکە، کەرەستان بزڤڕینە جهێن وان یێن تایبەت. ماددەیێن کیمیایی وگیراوان بزڤڕینە وان دەفرێن مامۆستایێ تە بۆ ئامادەکری. هیچ ماددەیەکێ کیمیایی نە ڕێژە دئافرویێ دا یان دسەلكا پاشمایاناندا بێ زانینا مامۆستایێ تە، پشتی کارێ تە ب دویماهیك هاتی، دەستێن خۆ ب ئاڤ وسابینێ باش بشۆ.

## ژمێریاری

هەمی ژمێریارێن خۆ بجه بینە، ودخشتەیەکی ژمێریارێن گونجای دا ڕێز بکە.

### پشکا 1

**1.** **ڕێکخستنا زانیاریان**: قەبارێ لولەکەکا هەتا نیشانا 50 mL دیار بکە. ($V=3.14 \times r^2 \times h$)

**2.** **دەرئەنجامێن بەلگەپێدای**: ئەگەر تە زانی بیت کە بەهایێ پەسەندکری دبیتە 50.0 $cm^3$ . شاشییێ وڕێژا سەدی یا شاشییێ چەندە.

### پشکا 2

**3.** **ڕێکخستنا زانیاریان**: بارستاییێ ئاڤێ دیار بکە وەك بکارئینانا تەرازیا پیڤانێ.

**4.** **ڕێکخستنا زانیاریان**: بارستاییێ ئاڤێ دیار بکە ژقەبارێ پیڤای وچڕیا وێ.

**5.** **دەرئەنجامێن بەلگەپێدای**: بکارئینانا بارستاییێ ئاڤا ب ڕێیا تەرازییێ هاتیە دیارکرن کو بهایەکێ پەسەندکریە. شاشییێ وڕێژا سەدی یا شاشییێ هەر یا وی بارستایا دیارکری بکارئینانا بارستەیی چڕی دیار بکە.

### پشکا 3

**6.** **ڕێکخستنا زانیاریان**: قەبارێ کانزای دیار بکە بکارئینانا پیڤانێن تە بۆ قەبارێ ئاڤا هاتیە لادان ژلایێ کانزای ڤە.

7. **ڕێکخستنا زانیاریان**: بکارئینانا پیڤانێن تە دخشتێ 3 دا، بارستایییێ کانزای دیار بکە.

8. **ڕێکخستنا زانیاریان**: چڕیا کانزای دیار بکە.

9. **دەرئەنجامێن بەلگەپێدای**: ژێدەرێن پەرتووکا یان ژمامۆستاییێ خۆ پرسیار بکە بۆ زانینا کێشا جۆری یا ئەوی کانزاییێ دتاقیکرنێ دا هاتیە بکارئینان (دسیستەمێ مەتری دا چڕیا شلان ومادەیێن ڕەق ب کێشا جۆری دهێتە پیڤان specific gravity). شاشی ورێژا سەدی یا شاشییێ یێن چڕیا کانزاییێ دپێنگاڤا 8 هاتیە دیارکرن دیار بکە.

## پشکا 4

10. **ڕێکخستنا دەرئەنجاما**: دخشتێ خوارێ دا پێنج بەهایێن تایبەت یێن چڕیا هەر وی کانزای ژهەڤالێن تەیێن دپولێ دا تۆمار بکە.

| چڕی ( $g/cm^3$ ) | هژمارا کۆمەڵێ |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |

11. **هەڵسەنگاندنا دەرئەنجامان**: ناڤەندێ چڕییێ $M$ بۆ هەر پێنج ئەنجامان دیار بکە.

**پرسیار**

1. **هەڵسەنگاندنا ڕێیان**: بەهاییێ پێتڤیە بزانین بۆ دیارکرنا هویریا پیڤانا تاقیکرنێ چنە؟

## دەرئەنجامێن گشتی

2. **هەلسەنگاندنا رێبیان:** ژێدەرێن ئەگەرێ شاشیا تاقیگەهی دڤێ تاقیکرنێ دا چنە؟

1. **هەلسەنگاندنا دەرئەنجامان:** سالار وسولین سێ جاران چڕیا شلەیەکی پیڤان، وئەڤ بهایە ب دەست کەفتن: $2.84\ g/cm^3$ ، $2.85\ g/cm^3$ ، $2.80\ g/cm^3$. ئەگەر بزانی کو بهایێ پەسەندکری $2.40\ g/cm^3$.

أ. ئەرێ بهایێن وسالار وسولین ب دەستخوڤە ئینیاین دروستن؟ وێ چەندێ پەسەند بکە.

ب. ئەرێ بهایان هویری تێدا هەنە؟ وێ چەندێ پەسەند بکە.

ج. رێژا سەدی یا شاشییێ وگومانێ بۆ هەر پیڤانەکێ دیار بکە.

| گومان: لادان ژناڤەندی چڕیێ $2.83\ g/cm^3$ | | | |
|---|---|---|---|
| تاقیکرن | چڕیا پیڤای $g/cm^3$ | ناڤەندە چڕی $g/cm^3$ | لادان $g/cm^3$ |
| 1 | | | |
| 2 | | | |
| 3 | | | |

## تاقیکرن 7

# پاراستنا بارستەیی

### ئەنجامێن فێربوونێ

- دێ نیشانێن رویدانا كارلێكا كیمیایی دكەت.
- بەڵگەپێدانێ لسەر رویدانا كارلێكا كیمیایی ددەت.
- بەراوردكرنا ماددێن كارلێكەر ومادددێن بەرهەمهێنەر دكەت.
- دارێژتنا تاقیكرنەیەكێ بۆ رێبەری كرنا یاسایا پاراستنا بارستەیی ددەت.
- گرێدانا داڤەرا تێبینیان ویاسایا پاراستنا بارستەیی دكەت.

### ماددە وكەرەستێن هەڤكۆمێ

- ئامانەكێ پلاستیكی قەبارە 2 L
- 270 mL ژ گیراوێ ترش سركێ (سركە) 5%
- تەرازیا ئەلكترۆنی یا هەستیار
- دوو پەرداخێن پلاستیكی یێن روون
- لولەكەكا پلەدار قەبارە 100 mL
- قەپاغا قولادار
- پالدەرەكێ بچویك هاریكاریێ تاقیگەهێ یێ ئامادەكری
- 17 g كاربۆناتێ سۆدیۆمێ هایدرۆجینێ (هویركێ هەڤیرێ)

### پێشەكی

یاسا پاراستنا بارستەیی دبێژیت: ماددە ژناڤ ناچیت ودروست نابیت ب رێیا كارلێكێن كیمیایی، ژبەر هندێ پێدڤیە بارستایێ هەر سیستەمەكێ كیمیایی ب جێگیری بمینیت دهەر كردارەكا كیمیایی دا. دڤێ تاقیكرنێ دا، دێ دیاربیت ئەرێ بارستە ما پاراستی، ب پشكنینا كارلێكا كیمیایی یا سادە وبەراوردكرن دناڤبەرا بارستایێ رژێمێ بەری كارلێكێ وپشتی كارلێكێ.

### سلامەتی

**هەردەم بەرچاڤكێن پاراستنێ وبەركۆشێ تاقیگەهێ بكاربینە بۆ پاراستنا چاڤ وجلكێن تە.** وئەگەر ماددەیەكێ كیمیایی چوو دچاڤێ تەدا ئێكسەر بشۆ ومامۆستایێ تایبەت ئاگەهدار بكە. ڤێرێ جهێ تەنگاڤیا سەرەتایی وجهێ شویشتنا چاڤان، وشارەزابە بۆ رێكێن بكارئینانا وان.

**دەستێ خۆ ل هیچ ماددەیەكێ كیمیایی نەدە.** ئەگەر ماددەیەكێ كیمیایی ب دەستێ تە یان جلكێن تە كەفت مامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بكە. خۆ ئەسەح بكە ژخاندنا وتێگەهشتنا زانیارێن لسەر دەفرێن ماددێن كیمیایی یێن تو بكاردئینی، ئەگەر نیشاندەر لسەر نەبوو، پسیار ژمامۆستایێ خۆ بكە. تام نەكە چ ماددەیەكا كیمیایی كو ل تاقیگەهێ دهێتە بكارئینان، چ ماددەیەكا كیمیایی یا بكارهاتی ڤەنەگێرە دەفرێ وی یێ بنەرەت، برێن كێم بكاربینە دا پیچ وپەلاچە نەبن.



**ئەگەر ماددەیەكێ كیمیایی رژت مامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بكە**، ودڤێت جهێ ماددە رژتیێ باش بشۆین ولدویف رێنمایێن مامۆستای.

### ئامادەكرن

دوو خشتێن زانیاریان دەفتەرا تێبینیێن تاقیگەهێ دا ئامادە بكە، ئێك ژ وان بۆ پشكا 1 ێ ژتاقیكرنێ ویێ دی بۆ پشكا 11 ێ. هەر خشتەیەكێ بكە چار خانە (ستوین) ناڤونیشانێن وان ب ڤی جۆری بنڤێسە: بارستایێ سەرەتایی (g)، بارستایێ دویماهیێ (g)، گوهۆرین دبارستێ دا (g)، ستوینا تێبینێن تایبەت ب كارلێكێ ڤە.

## ڕێکا کاری

## پشکا 1

1. پالدەرەکێ بچویك نقومی نموونەیەکا هویرکێ هەڤیری بکە هەتا پالدەر پڕ ببیت (برا 4-5 mL ژهویرکی دێ پالدەری پڕکەت).

2. پالدەری لسەر پەرداخێ پلاستیکی ڕابگرە، هەردوو لایێن پالدەری بگڤێشە دا هویرکێ هەڤیری بێتە خواری بۆ ناڤ پەرداخێ.

3. لولەکەکا پلەدار بکاربینە بۆ پیڤانا 100 mL ژسرکێ، ئەڤێ برێ بکە دناڤ پەرداخەکێ دی دا.

4. هەردوو پەرداخا دانە سەر تەرازیێ ل تەنشتێت ئێك، وبارستایێ گشتی یێ سیستەمێ (پێش کارلێکێ) بپیڤە بۆ نێزیکترین 0.01g. دخشتێ زانیاریاندا تۆمار بکە.




شێوێ (أ) تێکرنا سرکێ هێدی هێدی بۆ ڕێگرتنا دەرچوونا کارلێکی ژ ژێر کۆنترۆلا مە.

5. سرکێ هێدی هێدی بکە سەر هویرکێ هەڤیری، دا کارلێك ژ ژێر کۆنترۆلا مە دەر نەچیت، وەکی دیار دشێوێ (أ) دا. بهێلە سرکە هێدی هێدی بچیتە ناڤ پەرداخێ، سەحکێ چ ڕویددەت، تێبینیێن خۆ دەربارەی کارلێکێ تۆمار بکە.

6. پشتی تەمامبوونا کارلێکێ، هەردوو پەرداخان دانە سەر تەرازیێ وبارستایێ دویماهیێ یێ سیستەمی بۆ نێزیکترین 0.01g دیار بکە. هەر گوهۆڕینەکا دبارستایی دا بژمێرە، وبارستایێ دویماهیێ وهەر گوهۆڕینەکا دبارستایی دا دخشتێ زانیاریاندا تۆمار بکە.

7. لێنێرینا دەفرێ پلاستیکی وقەپاغا قولاپدار بکە، هەوڵبدە ب ڕێکەکا دی یاسایا پاراستنا بارستەیی تاقی بکە کو گەلەك هویرتر بیت ژڕێکا بکارهاتی دپشکا 1 دا.

8. ددەفتەرا تە یا تێبینیاندا بەرسڤێن بڕگێن 1-3 بنڤێسە ل ژێر شیکارکرنا ئەنجامان وشلوڤەکرنا وان.

## پشکا 2

9. دڤێت ڕازیبوونا مامۆستایێ خۆ وەربگری ل سەر وێ ڕێکا هاتیە پێشنیارکرن دپێنگاڤا 7 دا ژپشکا 1، ڕێکا هاتیە پێشنیارکرن جێبەجێ بکە بکارئینانا هەر وان برێن ماددێن کیمیایی یێن هاتینە بکارئینان دپشکا 1 دا، بەلێ بکارئینانا دقەپاغا قولاپدار شینا هەردوو پەرداخان. زانیاریێن خۆ دخشتێ زانیاریاندا تۆمار بکە.

10. ئەگەر دکارپێکرنا پێنگاڤا 9 دا سەرکەفتن ب دەستڤەئینا، وئەنجامێن تە پشتگیرییا یاسایا پاراستنا بارستەیی کر، بەردەوامبە ل سەر تەمامکرنا تاقیکرنێ، وئەگەر وەسا نەبوو کۆمەڵەکا دی یا بسەرکەفتن ئینای، گەنگەشێ دگەل ئەندامێن کۆمەڵێ بکە دبارێ وان پێڕابوونێن وان ئەنجامداین کو سەرکەفتن ئینایێن. وێ دەمی تو وکۆمەڵا تە دێ نەچاربن ڕێکا کاری یا کۆمەڵەکا دی تاقی بکەن بۆ دیارکرنا ئەرێ ئەنجامێن وان شیانێن دووبارەبوونێ هەنە.

## پاقژکرن وڕزگاربوون ژبەرمایکان



11. جهێ کاری وهەمی کەرەستێن تە بکارئینایین دتاقیکرنێ دا ڤەگێرە جهێن وان یێن تایبەت، ماددەیێن کیمیایی وگیراوان ڤەگێرە وان دەفرەیێن مامۆستایێ تە ئامادەکرین. هیچ ماددەیەکێ کیمیایی نە ڕێژە دئافرۆێ دا یان دسەڵکا بەرمایکان بێ زانینا مامۆستایێ تە، پشتی کارێ تە بدویماهیك هاتی، دەستێن خۆ ب ئاڤ وسابینێ بشۆ بەری ژتاقیگەهێ ب دەرکەڤی.

## شیکارکرنا ئەنجامان وشلوۆڤەکرنا وان

## پشکا 1

1. **دەرئەنجامێن بەلگەپێدای**: چ بەلگە هەیە کو کارلێکا کیمیایی ڕویدا؟
2. **ڕێکخستنا زانیاریان**: چەوا دێ شێی بارستایێ دویماهیێ یێ ڕژێمەکێ دگەل بارستایێ سەرەتایی بەراورد بکەی؟
3. **چارە بۆ جوداهیان**: ئەرێ بەرسڤا تە دپرسیارا پێشدا دیاربوو کە دگەل یاسایا پاراستنا بارستەیی نە گونجا؟

(تێبینی: ڕێکەکا دی یا هەی دەربرینێ ژیاسایا پاراستنا بارستەیی، ئەڤیە کو دبێژیت: بارستایی هەمی ئەو ماددەیێن دچنە دکارلێکێ دا یەکسانی بارستایی هەمی ئەو ماددەیێن پەیدا دبن).

## پشکا 2

1. **دەرئەنجامێن بەلگەپێدایێ**: ئەرێ بەڵگەیەك هەیە دپشکا 2 دا ئاماژێ بدەت کە کارلێکا کیمیایی ڕویدا؟
2. **ڕێکخستنا هزرا**: دۆخێ هەر ماددەیەکێ کارلێککری دپشکا 2 دیار بکە. وهەروەسا دۆخێ هەر ماددەیەکێ بەرهەم هاتی دکارلێکێ دا دیار بکە؟

## دەرئەنجام

1. **گرێدانا هزرا (بیروکا)**: چ جوداهی دناڤبەرا سیستەمێ پشکا 1 وسیستەمێ پشکا 2 دا هەیە؟ ئەو چ گوهۆڕین بوو بۆ ئەگەرێ باشکرنا ئەنجامێن پشکا 2 یێ؟
2. **هەڵسەنگاندنا ڕێیان**: بۆچی ڕێکا کاری دپشکا 11 دا باشترە ژڕێکا کاری دپشکا 1 دا؟

## زێدەبار


شێوێ (ب)

1. **داڕشتنا تاقیکرنان**: چەوا دێ یاسایا پاراستنا بارستەیی دێ ئەنجامدەی، ئەگەر تویرکەکێ پلاستیکی کو شیانێن داێخستنێ هەبن، وەك دیار دشێوێ (ب) دا، دگەل بەنکەکێ بچویك ل شوینا قەپاغا قولاپدار؟ ڕێکا کاری ئەوا تە پێشنیارکری پێنگاڤ پێنگاڤ جودا بکە.
2. **پێشبینیا ئەنجامان**: ئەرێ تو پێشبینیا سەرکەفتنێن پەسەندکری دکەی بکارئینانا تویرکێ پلاستیکی وبەنکی؟ بۆچی؟ ئەگەر دەم ڕێکێ بدەت تە، وان پێنگاڤێن تە پێشنیارکرین بجه بینە، ڕاستیا بۆچوونێن خۆ تاقی بکە، ڕاپۆرتەکێ بنڤێسە وهەوڵبدە شلوۆڤەکرنا هەر جوداهییەکا ببینی.

(تێبینی: جوداهی چییە دنافبەرا ئەوا ڕویدای بکارئینانا تویرکێ وئەوا ڕویدای بکارئینانا دەفری)؟

3. **بکارئینانا نموونان**: دەمێ سوتنا پارچەکا دارەکی تشتەکێ سروشتی یە کە بارستایێ بەرهەم هاتی کێمترە ژبارستایێ پارچا دارێ سوتی. ڕوون بکە ئەرێ بەرزەکرن دبارستای دا دگەل یاسایا پاراستنا بارستەیی نا گونجیت؟
4. **داڕشتنا تاقیکرنان**: ڕێکەکا کاری دابرێژە بۆ تاقیکرنا یاسایا پاراستنا بارستایی دەربارەی پارچا دارێ سوتی ئەوێ دپشکا 3 دا هاتیە بەحس کرن.

ناڤ ........................ ڕۆژ ........................ پۆل ........................

## بەندێ 4
## ڕێزبوونا ئەلکترۆنان دگەردیلاندا

### پێداچوونا پشکا 1-4
### گەشەکرنا دنموونا نوی یا گەردیلێ دا

**کورتەبەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە دجهێ دیارکری دا:

**1.** چەوا کارتێکرنا کارۆڕووناهییێ پشتگیریا بیردۆزا تەنوکی یا ڕووناهییێ دکەت؟

______________________________

______________________________

**2.** چ جوداهی دناڤبەرا بارێ ئاسایی (جێگیر) وبارێ ئازرایی ل بارێ ئەلکترۆن تێدا؟

______________________________

______________________________

______________________________

**3.** چەوا گەردیلە دێ شێت فۆتۆنەکێ دەت؟

______________________________

______________________________

**4.** چەوا دێ شێن ئاستێن وزا ئەلکترۆنان ب پیڤەرێ ڕووناهیا گەردیلێ دەرپەڕیت دیار بکەین؟

______________________________

______________________________

**5.** بۆچی تیشکا کارۆموگناتیسی ل ناوچا ژوور بنەفشی وزەیەکا مەزنتر ژ وزا تیشکا دناوچا ژێر سۆرا دەردبڕیت؟

______________________________

______________________________

______________________________

ناڤ ............................................ ڕۆژ ............................ پۆل ............................................

6. کیژ ڤاان پێلێن ل خوارێ لەرەیا بلندتر هەیە؟ بەرسڤا خوە لێکبدە.

---

---



7. چەند جارا فوتونان تیشکەك ژگەردیلێن هیلیوومێ ئازریایی دەربەڕین بو پێك ئینانا شەپەنگا ل خوارێ؟ بەرسڤا خوە لێکبدە.

---

---

---



**پرسیار: بەرسڤێ ل لایێ ڕاستێ یێ پرسیارێ بنڤیسە. ڕێکا کارکرنا خوە ب تەمامی دڤالاهییا هاوپێچدا دیاربکە.**

8. ______________ درێژییا پێلەکا ڕووناهیێ 310 mm دبیت. لەرەیا وێ چەندە؟

9. ______________ درێژییا پێلەکا تیشکا کارۆموگناتیسی چەندە ئەگەر لەرەیا وێ یەکسانی $3.2 \times 10^{-2}$Hz؟

ناڤ .................................... رۆژ .................... پۆل ....................

## بەندێ 4
## ڕێزبوونا ئەلکترۆنان دگەردیلاندا

## پێداچوونا پشکا 2-4
# نموونا برە یا گەردیلی

**کورتە بەرسڤ:** بەرسڤا ڤان پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1.** ______ هژمارا ڕەنووسێن برە چەندن کو باسێ بارێ وزا ئەلکترۆنی دکەت دگەردیلەیەکا نە دیارکری دا؟

أ. 1     ج. 3

ب. 2     د. 4

**2.** ______ ئەورێ ئەلکترۆنی یێ گرۆڤر ئەوێ لدورا ناڤکا گەردیلێ نوینەراتیا.

أ. ئۆرپیتالێ $s$     ج. ئێککگرتنا دوو ئۆرپیتالان ژ $p$ یێن جودا جودا.

ب. ئۆرپیتالێ $p$     د. ئێککگرتنا ئۆرپیتالێ $s$ وئۆرپیتالێ $p$ .

**3.** ______ ئاستەکێ وزی یە $n = 4$ ______ ئەلکترۆن تێدانە.

أ. 32     ج. 8

ب. 24     د. 6

**4.** ______ ئاستەکێ وزی یە $n = 2$ ______ ئەلکترۆن تێدانە.

أ. 32     ج. 8

ب. 24     د. 6

**5.** ______ ئەلکترۆن ل $n = 4$ خودان ______ مەزتر ژئەلکترۆنێ ل $n = 2$.

أ. بادەیەکا     ج. وزەیەکا

ب. جێگیریەکا     د. سروشتیەکا پێلێ

**6.** ______ لدویڤ بیردۆزا (بۆر)ی، ئەلکترۆن نەشێن ل ______ دوێنێ خوارێ دا.

أ. خالا (أ)     ج. خالا (ج)

ب. خالا (ب)     د. خالا (د)



ناڤ ........................ رۆژ ........................ پۆل ........................

7. ______ ل دویڤ بیردۆزا برە، خالا (د) دوێنیێ پێشییێ دا.

أ. جهێ ئەلکترۆنییێ جێگیرە
ب. دویرترین جهـ ژناڤکێ کو ئەلکترۆن بشێت بگەهتێ
ج. جهەکە کو چێدبیت ئەلکترۆن لێ بیت
د. جهەکە چێ نابیت ئەلکترۆن لێ بیت

8. چەوا دیرۆکلی ئەنجامدا کو ئەلکترۆنان سروشتیا پێلی یا هەی؟

9. هەر ئێك ژهەر چار هژمارێن براڤ وسەخلەتێن هەر ئێك ژوان دیار بکە.

10. ئەڤ خشتێ ل خوارێ تەمام بکە:

| هژمارا برا سەرەکی ($n$) | هژمارا ژێر ئاستان | جۆرێن ئۆربیتالان |
| --- | --- | --- |
| 1 | | |
| 2 | | |
| 3 | | |
| 4 | | |

ناڤ ........................ ڕۆژ ........................ پۆل ........................

## بەندێ 4
## ڕێزبوونا ئەلکترۆنان دگەردیلادا

### پێداچوونا پشکا 4-3
# ڕێزبوونا ئەلکترۆنی

**کورتەبەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1.** بەراوردی وەهەڤبەری دناڤبەرا ڕێسایا هۆند وبنەمایێ پاولی دا بکە.

________________________________________

________________________________________

________________________________________

**2.** ئەوا مەرجان ڕوون بکە کو لژێر کارتێکرنا وی هیلیۆم دشێت ئەڤ هێماکرنا ئۆرپیتالێ: $\frac{\uparrow \quad \uparrow}{1s \quad 2s}$ هەبیت:

________________________________________

________________________________________

**ڕێزبوونا ئەلکترۆنی وهێماکرنا ئۆرپیتالێ یا هەر ئێك ژ گەردیلێن خوارێ بنڤیسە:**

**3.** فۆسفۆر

**4.** نایترۆجین

**5.** پۆتاسیۆم

**6.** ئەلمنیۆم

ناڤ .................................................. رۆژ .................................... پۆل ....................................

7. ئارگۆن

8. بۆرۆن

9. کیژ ژڤان ڕێزبوونێن ئەلکترۆنێن ل خوارێ ڕێسایا هۆند ل گەل نا گونجیت:

أ. ______________ . $1s^2$ ↑↓, $2s^2$ ↑↓, $2p^6$ ↑↓ ↑↓ ↑↓, $3s^2$ ↑↓

ب. ______________ . $1s^2$ ↑↓, $2s^2$ ↑↓, $2p^4$ ↑↓ ↑↓ [ ]

10. کیژ ژڤان ڕێزبوونێن ئەلکترۆنێن ل خوارێ بنەمایێ پاولی یێ دویرکەفتی ل گەل نا گونجیت:

أ. ______________ . $1s^2$ ↑↓, $2s^2$ ↑↓, $2p^6$ ↑↓ ↑↓ ↑↓, $3s^2$ ↑↑

ب. ______________ . $1s^2$ ↑↓, $2s^2$ ↑↓, $2p^4$ ↑↓ ↑ ↑

ناڤ ........................................ ڕۆژ ........................ پۆل ........................

بەندێ 4
ڕێزبوونێ ئەلکترۆنان دگەردیلاندا

# پێداچوونا جۆراوجۆر

**کورتە بەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1.** لژێر چ باری دا مادده ڕووناهیێ پێک دئینیت؟

______________________________________________

______________________________________________

**2.** هژمارێن بڕی چ وەسف دکەن؟

______________________________________________

**3.** پەیوەندی دناڤبەرا هژمارا بڕا سەرەکی و ڕێزبوونا ئەلکترۆنی دا چییە؟

______________________________________________

______________________________________________




**4.** چەوا شێوێ سەری ڕێسایا هۆند ڕوون دکەت؟

______________________________________________

______________________________________________

**5.** چەوا ئەو شێوێ سەری بنەمایێ پاولی یێ دوریکەفتنێ ڕوون دکەت؟

______________________________________________

______________________________________________

ناڤ ................................ رۆژ ................................ پۆل ................................

**6.** وەسا دیارە توخمێن ئاستێ وزا چارێ وئاستێن سەرەکییێن بلندێن وزێ،  لدویف ڕێزبوونا سروشتی یێ پڕکرنا ئۆرپیتالان ناکەن، بۆچی؟

---

---

**7.** چەوا ئەلکترۆن ڕەنگان دشەپەنگا دەربڕینا هێلی دا، پێك دئینن؟

---

---

**8.** ڕیزبوونا ئەلکترۆنی یا گەردیلێن خوارێ بنڤێسە:

**أ.** کاربۆن

---

**ب.** پۆتاسیۆم

---

**ج.** کالسیۆم

---

**د.** مس

---

---

**پرسیارەك: بەرسڤێ دڤالاهییا لایێ ڕاستێ یێ پرسیارێ بنڤێسە. ڕێکا کارکرنا خۆ ب تەمامی دڤالاهییا هاوپێچ دا بنڤێسە.**

**9.** ______________ درێژی پێلەکا ڕووناهی چەندە، ئەگەر لەرەیا (لەرزین) وێ دڤالاهیێ دا یەکسانی $3 \times 10^{-4}$ Hz ؟

ناڤ .................... ڕۆژ .................... پۆل ....................

بەندێ 5
یاسایا خولی

پێداچوونا پشکا 1-5
# دیرۆکا خشتێ خولی

**کورتە بەرسڤ:** بەرسڤا ڤان پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1.** توخم دخشتێ خولی یێ نویدا، لدویڤ ——— دهێنە ڕێزکرن.

أ. کێمبوونا بارستا گەردیلەیی

ب. نەخشێ بنچینەیێ مەندەلیف

ج. زێدەبوونا هژمارا گەردیلەیی

د. مێژوویا ڤەدیتنا وێ

**2.** ——— مەندەلیف تێبینی کر، کو ساخلەتێن توخمان ماوێن ڕێك وپێك دیاربووینە دەما ئەو توخم لدویڤ زێدەبوونا بەهایی ——— ڕێکخستین.

أ. چڕی

ب. چالاکی

ج. هژمارا گەردیلەیی

د. بارستا گەردیلەیی

**3.** ——— دەقێ یاسایا خشتێ خولی یێ نوی بڤی جۆرەیە:

أ. نابیت دوو ئەلکترۆن دئێك جهێ هەمان گەردیلە دابن ئەگەر ئێك بەهایێ بادانێ هەبیت.

ب. ساخلەتێن فیزیایی وکیمیایی یێن توخمان پشت ب هژمارا گەردیلێن وان دبەستیت.

ج. ئەلکترۆن سەحلەتێن تەنولکا وپێلان پێکڤە دیار دکەن.

د. ساخلەتێن کیمیایی یێن توخمان لدویڤ خولێتیێ دپولێن کرینە، بەلێ نە دشیاندایە ساخلەتێن فیزیایی لسەر ئەڤان بنەمایا ب پۆلێنن.

**4.** ——— ب ڤەدیتنا گازێن نایاب گوهۆڕین بسەر خشتێ خولی یێ مەندەلیف داهات ب زێدەبوونا ———

أ. خولەکا نۆی

ب. زنجیرەکا نوی

ج. کۆمەکا نوی

د. خشتەکێ ئاستێ تایێ نوی

**5.** ——— سیفەتێ جوداکارێ گازێن نایاب ئەوەیە کو:

أ. کانزانە

ب. تیشکدەرن

ج. نیمچە کانزانە

د. کێم چالاکن

**6.** ——— لیثیۆم، توخمێ ئێکێ یە دکۆمەلا 1 ، گەردیلە هژمارا وی 3 یە، وتوخمێ دووێ دڤێ کۆمەلێدا هژمارا گەردیلا وی:

أ. 4

ب. 10

ج. 11

د. 18

ناڤ ................................ رۆژ ........................ پۆل ..............................

7. هەڤبەر (هاوتا)ێ فلۆر کو هژمارا بارستا وی = 19 وگەردیله هژمارا وی = 9 .

أ. چەند پرۆتۆن دڤێ گەردیلێدا هەنە؟ ________

ب. چەند نیۆترۆن دڤێ گەردیلێدا هەنە؟ ________

ج. هێما گەردیلا فلۆری بنڤێسه دگەل بارسته هژماره وگەردیله هژمارا وی. ________

8. سەماریۆم Sm توخمەکێ زنجیرا لانثینەکانه.

أ. ئەو توخمێ ئێکسەر دکەڤیته ژێر سەماریۆمی دخشتێ خولیدا دیار بکه. ________

ب. جوداهی یا دناڤبەرا هژمارا گەردیلەیی یا ئەڤان هەردوو توخمان بنڤیسه. ________

9. هاوتایەك 53 پرۆتۆن و 78 نیۆترۆن تێدانه.

أ. گەردیله هژمارا وی چەندە؟ ________

ب. بارستا ئەڤێ گەردیلێ بیەکا ( amu )چەندە (بۆ نێزیکترین هژمارا تەواو) ________

ج. ئەرێ ئەڤ توخمه Pt ، یان Xe یان I ، یان Bh ە. ________

د. دوو توخمێن دی دئەڤێ کۆمەلێدا دیار بکه. ________

10. دخشتێ خولی یێ نویدا، هەر توخمەك ئەندامەکه درێژەکا ئاسۆیی وستوینەکا شاقوڵی دهەمان وەخت دا، کیژ وان دەربرینێ ژکۆمەڵێ وکیژ وان ژخولی دکەت؟

________

________

11. جوداهی یا دناڤبەرا بارسته هژماره وگەردیله هژماره شلۆڤه بکه.

________

________

12. دخشتێ خولیدا، بارستاییا گەردیلا تیلیریۆم ویۆد کێم دبیت شینا کو زێده ببیت، بەلێ هژمارا گەردیلێن وان زێده دبیت. وئەڤ دیاردەیه بۆ توخمێن دی یێن نێزیك دخشتێ خولیدا ڕوی ددەت، ناڤێن دوو کۆمەلا ژئەڤان توخمان بنڤێسه.

________

________

________

ناڤ ............................ رۆژ ............................ پۆل ............................

# بەندێ 5
# یاسایا خولی

## پێداچوونا پشکا 2-5
## رێزبوونا ئەلکترۆنی وخشتێ خولی

**کورتەبەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

ئەڤ خشتێ خولی یێ خوارێ بکاربینە بۆ بەرسڤدانا پرسیارێن دهێن:

| E | E |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  | E / A | E / A | E / A | E / A | E / A | E / A |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 H 1.00794 |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  | G: 2 He 4.002602 |
| B: 3 Li 6.941 | C: 4 Be 9.012182 |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  | 5 B 10.811 | 6 C 12.011 | 7 N 14.00674 | 8 O 15.9994 | F: 9 F 18.9984032 | 10 Ne 20.1797 |
| 11 Na 22.989768 | 12 Mg 24.3050 | D | D | D | D | D | D | D | D | D | D | 13 Al 26.981539 | 14 Si 28.0855 | 15 P 30.9738 | 16 S 32.066 | 17 Cl 35.4527 | 18 Ar 39.948 |
| 19 K 39.0983 | 20 Ca 40.078 | 21 Sc 44.955910 | 22 Ti 47.88 | 23 V 50.9415 | 24 Cr 51.9961 | 25 Mn 54.93805 | 26 Fe 55.847 | 27 Co 58.93320 | 28 Ni 58.6934 | 29 Cu 63.546 | 30 Zn 65.39 | 31 Ga 69.723 | 32 Ge 72.61 | 33 As 74.92159 | 34 Se 78.96 | 35 Br 79.904 | 36 Kr 83.80 |
| 37 Rb 85.4678 | 38 Sr 87.62 | 39 Y 88.90585 | 40 Zr 91.224 | 41 Nb 92.90638 | 42 Mo 95.94 | 43 Tc (97.9072) | 44 Ru 101.07 | 45 Rh 102.906 | 46 Pd 106.42 | 47 Ag 107.8682 | 48 Cd 112.411 | 49 In 114.818 | 50 Sn 118.710 | 51 Sb 121.757 | 52 Te 127.60 | 53 I 126.904 | 54 Xe 131.29 |
| 55 Cs 132.90543 | 56 Ba 137.327 | 57 La 138.9055 | 72 Hf 178.49 | 73 Ta 180.9479 | 74 W 183.84 | 75 Re 186.207 | 76 Os 190.23 | 77 Ir 192.22 | 78 Pt 195.08 | 79 Au 196.96654 | 80 Hg 200.59 | 81 Ti 204.3833 | 82 Pb 207.2 | 83 Bi 208.98037 | 84 Po (208.9824) | 85 At (209.9871) | 86 Rn (222.0176) |
| 87 Fr (223.0197) | 88 Ra (226.0254) | 89 Ac (227.0278) | 104 Rf (261.11) | 105 Db (262.114) | 106 Sg (263.118) | 107 Bh (262.12) | 108 Hs (265)** | 109 Mt (265)** |  |  |  |  |  |  |  |  |  |

| 58 Ce 140.115 | 59 Pr 140.908 | 60 Nd 144.24 | 61 Pm (144.9127) | 62 Sm 150.36 | 63 Eu 151.966 | 64 Gd 157.25 | 65 Tb 158.92534 | 66 Dy 162.50 | 67 Ho 164.930 | 68 Er 167.26 | 69 Tm 168.93421 | 70 Yb 173.04 | 71 Lu 174.967 |  |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 90 Th 232.0381 | 91 Pa 231.03588 | 92 U 238.0289 | 93 Np (237.0482) | 94 Pu 244.0642 | 95 Am (243.0614) | 96 Cm (247.0703) | 97 Bk (247.0703) | 98 Cf (251.0796) | 99 Es (252.083) | 100 Fm (257.0951) | 101 Md (258.10) | 102 No (259.1009) | 103 Lr 262.11 | H |

**1.** توخمی دەستنیشان بکە، وهێمایا گازا نایابا بۆ هەر ئێك ژ ئەڤێن خوارێ بنڤێسە:

أ. توخمەکێ کۆمەلا 14 وخولا 4

______________________________________________

**ب.** تاکە کانزا دکۆمەلا 15 دا

______________________________________________

**ج.** ئەو کانزایێ گواستراو کو بچوکترین هژمارا گەردیلەیی هەی.

______________________________________________

**د.** ئەو کانزایێ تفتی کو مەزنترین هژمارا گەردیلەیی هەی.

______________________________________________

ناڤ .................................. رۆژ .................................. پۆل ..................................

2. دخشتێ خولیدا ئەوێ ل بەرپەڕێ بەری نوکەدا، چەند جهەك هەنە نیشانا وان A-H ە.

أ. جهێ A دەربڕینێ ژخشتوكێ $s$ یان $p$ یان $d$ یان $f$ دكەت. ____________

ب. دەڤەرێن مایی دخشتەیدا دەستنیشان بکە، بەرسڤێ ژناڤکرێن خوارێ هەلبژێرە: توخمێن سەرەکی، توخمێن گواستراوە، لانثینەکان، ئەکتینەکان، کانزایێن تفتی، کانزایێن تفتێن ئەردی، هالۆجین، گازێن نایاب.

B ____________

C ____________

D ____________

E ____________

F ____________

G ____________

H ____________

3. ب پشتبەستن ب خشتێ خولی، هێما وخول وکۆمەڵە وخشتەکی هەر ئێك ژئەڤان توخمێن دئێن دیار بکە:

أ. گۆگرد

____________

ب. نیکل

____________

ج. $[Ar]4s^1$

____________

د. $[Ar]3d^54s^1$

____________

4. دخشتێ خولیدا 18 ستوین هەنە، هەرئێك ژوان ڕەنووسێ کۆمەڵەکێ یێ هەی، ڕەنووسێن ئەوان کۆمەلا بنڤێسە ئەوێن هەر ئێك ژئەڤان خشتەکێن خوارێ پێك دئینن:

أ. خشتەکێ $s$ ____________

ب. خشتەکێ $p$ ____________

ج. خشتەکێ $d$ ____________

ناڤ .................................... رۆژ ........................... پۆل ..............................

بەندێ 5
یاسایا خولی

پێداچوونا پشکا 3-5

# ڕێزبوونا ئەلکترۆنی وساخلەتێن خولێتیێ

**کورتە بەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

1. ______ دەما ئەلکترۆنەکی لسەر گەردیلەکا هەڤ بارگە (بێبارگ) زێدە بکەی، وزە:
   أ. هەرگاڤ مێژراپە
   ب. هەرگاڤ دەرپەڕیە
   ج. مێژراپە یان دەرپەڕی یە
   د. دسوژیت

2. ______ وزەیا پێتڤی بۆ ژێ ستاندنا ئەلکترۆنی ژگەردیلەیەکێ دبێژنێ ______ گەردیلێ.
   أ. هۆگرێ ئەلکترۆنی
   ب. وزەیا ئەلکترۆنی
   ج. کارۆ سالیبێتی
   د. ئەرکی ئایۆنانێ

3. ب ڤەگۆهاستن ژچەپ بۆ ڕاستێ خولی دخشتێ خولیدا،
   ______ أ. هۆگرێ ئەلەکترۆنی ______ (زێدە دبیت یان کێم دبیت)
   ______ ب. بەهایێ ئەرکێ ئایۆنێن ______ (مەزنتر یان بچویکتر) دبیت؟
   ______ ج. نیڤ تیرا گەردیلەیی ______ (مەزنتر یان بچویکتر) دبیت؟

4. ______ أ. ناڤێ وی هالۆجێنێ کو کێمترین هۆگرێ ئەلکترۆنی هەی بێژە.
   ______ ب. ناڤێ وی کانزاییێ تفتی یێ بەرزترین ئەرکێ ئایۆنانی هەی بێژە.
   ______ ج. ناڤێ وی توخمێ دخولا 3 دا کە بچویکترین نیڤ تیرا گەردیلەیی هەی بێژە.
   ______ د. ناڤێ وی توخمێ دخولا 14 دا کە بەرزترین کارۆسالیبێتی هەی بێژە.

5. ڕیزبوونا ئەلکترۆنی بۆ ئەڤێن دهێن بنڤیسە:

أ. Na ______

ب. $Na^{+}$ ______

ج. O ______

د. $O^{2-}$ ______

هـ. $Co^{2+}$ ______

ناڤ .............................................. ڕۆژ ................................ پۆل ..........................................

**6.** أ. بەراوردیێ دناڤبەرا درێژیا نیڤ تیرەیا ئایۆنێ موجەب ونیڤ تیرەیا گەردیلا وی یا هاوبارگ بکە.

______________________________________________

______________________________________________

**ب.** بەراوردیا درێژیا نیڤ تیرە یا ئایۆنێ سالب ونیڤ تیرەیا گەردیلا وی یا هاوبارگ بکە.

______________________________________________

______________________________________________

**7.** أ. جهێن نێزیکەیی وخشتۆکێن کانزا ونەکانزاییێن خشتێ خولی چنە؟

______________________________________________

______________________________________________

**ب.** کیژ وان حەزا پێکئینانا ئایۆنێن موجەب دکەن، کانزا یان نە کانزا؟ کیژ وان حەزا پێکئینانا ئایۆنێن سالب دکەن؟

______________________________________________

______________________________________________

**8.** دخشتێ 5-3 ، ل بەرپەڕێ 137 ژپەرتووکا قوتابی وزەیێن ئایۆناندنێ بۆ چەند توخمان لدویڤ ئێك نڤیسینە:

________ أ. ئەو ئەلکترۆنێ ژئەرکێ ئایۆناندنا ئێکێ مەگنیسیۆمیدا هاتیە ستاندن، دیار بکە.

________ **ب.** ئەو ئەلکترۆنێ ژئەرکێ ئایۆناندنا دووێ مەگنیسیۆمیدا هاتیە ستاندن، دیار بکە.

________ **ج.** ئەو ئەلکترۆنێ ژئەرکێ ئایۆناندنا سێیێ مەگنیسیۆمیدا هاتیە ستاندن، دیار بکە.

**د.** ڕوونبکە، بۆچی ئەرکێ ئایۆناندنا دووێ ژئێکێ بلندترە وسێیێ ژدووێ بلندترە وهەروەسا....

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

**9.** ڕوونبکە کارێ ئەلکترۆنێن هاوهێزی دپێکئینانا ئاوێتێن کیمیاییدا.

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

ناڤ .................... ڕۆژ .................... پۆل ....................

# بەندێ 5
# یاسا خولی

# پێداچوونا هەمەجۆر

**کورتە بەرسڤ: بەرسڤا ڤان پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:**

**1.** توخمەکێ هاوبارگە کە 53 پرۆتۆن و 74 نیوترۆن هەنە، بەرسڤا ئەڤان پرسیاران بدە:

______ أ. گەردیلە هژمارا وی چەندە؟

______ ب. بارستا گەردیلێ ب یەکەیا *amu* چەندە؟

______ ج. ئەرێ جهێ توخمی دخشتێ خولیدا، لدویڤ گەردیلا هژمارا وی یان بارستا گەردیلا وی دهێتە دیارکرن؟

**2.** توخمەك ڕیزبوونا ئەلکترۆنیا بەرگێ دەرەکی $3d^{10}4s^{2}4p^{x}$ بیت.

______ أ. ئەڤ توخمە دکیژ خولێدایە؟

______ ب. ئەگەر ئەڤ توخمە هالۆجین بیت، بەهایێ $x$ چەندە؟

______ ج. ڕەنووسێ کۆمەلێ دبیتە ( $x + 2 + 10$ ) ڕاستە یان هەلّەیە؟

**3.** ______ أ. نیمچە کانزان دکیژ خشتوکێن $f$ ، $d$ ، $p$ ، $s$ دا هەنە؟

______ ب. چڕترین وسەختترین کانزا دکیژ خشتەکا $f$ ، $d$ ، $p$ ، $s$ دانە؟

**4.** ______ أ. ناڤێ چالاکترین هالۆجین ژڕوویێ کیمیاییڤە بێژە.

______ ب. ڕیزبوونا وی یا ئەلکترۆنی بنڤیسە.

______ ج. ڕیزبوونا ئەلکترۆنی یا جێگیرترین ئایۆنێ ئەڤی توخمی بنڤیسە.

**5.** ڤەگەریان بۆ خشتێ خولی، لسەرێ بەرپەڕێ 88 ێ ئەڤێ پەرتووکێ، بەرسڤا ئەڤان پرسیارێن دهێن بدە کو تایبەتن ب پلەکرنا ساخلەتێن ناڤبەرا خولان.

______ أ. کیژ وان مەزنترین نیڤ تیرا گەردیلەیی هەیە In یان Al ؟

______ ب. کیژ وان مەزنترین نیڤ تیرا گەردیلەیی هەیە Ca یان Se ؟

______ ج. کیژ وان مەزنترین نیڤ تیرا گەردیلەیی هەیە $Ca^{2+}$ یان Se؟

______ د. کیژ هەردووا ئەرکێ ئایۆناندنا وی زۆرترە، کانزان یان نە کانزان؟

______ هـ. کیژ وان ئەرکێ ئایۆناندنا وی زۆرترە، Cl یان As؟

ناڤ .................................................. رۆژ .............................. پۆل ..................................

و. ________ توخمەك هۆگرێ ئەلكترۆنی سالب یێ بەرزە، ئەرێ پتریا جاران ئایۆنێ موجەب یان ئایۆنێ سالب یان گەردیلا هاوبارگ پێك دئینیت؟

ز. ________ بشێوەیەكێ گشتی، كیژ گەردیلان هێزا ئەلكترۆن ڕاكێشانێ زۆرترە، گەردیلێن مەزن یان یێن بچویك؟

ح. ________ Se یان O، كیژ وان كارۆسالبێتی یا وی زۆرترە؟

ط. ________ ل بەندا هاوبەش دناڤبەرا O و Se بۆ كیژ گەردیلێ جووتەك ئەلكترۆن پتر دهێتە ڕاكێشان؟

ی. ________ هژمارا ئەلكترۆنێن هاوهێزی دگەردیلا Se یا هاوبارگ دا چەندن؟

6. ________ ئەو ئایۆنێن خوارێ ئەوێن جێگیریا گازا نایاب نەبیت دیار بكە:

$Zn^{2+}$ $Al^{3+}$ $I^{-}$ $Ca^{+}$ $S^{2-}$ $K^{+}$

7. بتنێ بكارئینانا خشتێ خولی، ئەوێ ل بەرپەڕێ 88 ێ ئەڤێ پەرتووكێ، هێماكاریا گازا نایاب بۆ ئەڤێن خوارێ بنڤیسە:

أ. ________ Br

ب. ________ $Br^{-}$

ج. ________ ئەو توخمێ دكۆمەلا 13 وخولا 5 دا.

د. ________ كانزایەكێ لانثانید كو بچویكترین هژمارا گەردیلەیی هەبیت.

8. جهێ دخشتێ خولیدا وڕێزبوونێن ئەلكترۆنی بكاربینە بۆ دیاركرنا ساخلەتێن كیمیایی بۆ كالیسیۆم وئۆكسجین.

________________________________________

________________________________________

________________________________________

________________________________________

9. دێ شێین پێشبینی ڕێزبوونا ئەلكترۆنی یا مسی بكەین كو $3d^{9}4s^{2}$ بیت. بەلێ ب ڕاستی ڕێزبوونا وی یا ئەلكترۆنی $3d^{10}4s^{1}$. وئەو دوو توخمێن دكەڤنە ل ژێر مسی دكۆمەلا 11 دا ب هەمان شێوە ڕەفتارێ دكەن. (ئەڤ كارە دخشتێ خولیدا دشێوێ 5-6 ێ بەرپەڕێن 122-123 ژپەرتووكا قوتابی هاتیە سەلماندن).

أ. ________ كیژ ڕێزبوونا ئەلكترۆنی جێگیریەكا پتر دیار دكەت؟

ب. ________ دگەردیلێن ئەڤان هەرسێ توخمان ئەرێ ژێر ئاستێ d تێر دبن؟

ج. ________ بۆ هەر توخمەكێ خولا 4 ێ، چوار بەرگێن سەرەكی پڕن ژئەلكترۆنان، ڕاستە یان هەلەیە؟

ناڤ ............................ رۆژ ................ پۆل ................

بەندێ 6
بەندێن کیمیایی

پێداچوونا پشکا 1-6

# پێشەکیا بەندێن کیمیایی

**کورتە بەرسڤ:** بەرسڤا ڤان پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1.** بەندا هاوبەش یا تاک پێك دهێت ژ ______ .

**أ.** ئەلکترۆنا هاوبەش

**ب.** جووتەك ئەلکترۆنا هاوبەش

**ج.** ڕاکێشانا دوو ئایۆنێن ژێك جودا

**د.** جووتەك ئەلکترۆنا هاوبەش

**2.** ئەگەر دوو گەردیلێن وەکهەڤ ب هاوبەش بەند پێکڤە بەندکری بن، دێ بەندا وان ______ دبیت.

**أ.** هاوبەشا بێ جەمسەر

**ب.** هاوبەشا جەمسەردار

**ج.** هایدرۆجینی

**د.** دوو جەمسەر

**3.** ئەو هاوبەش بەندا کو هێزا هەڤکێشانا ئەلکترۆنێن پشکدار تێدا یەکسان نەبیت دێ ______ دبیت.

**أ.** بێ جەمسەر

**ب.** جەمسەردار

**ج.** هاوبەش

**د.** دوو جەمسەر

**4.** ئەو گەردیلێن هێزا ئەلکترۆن ڕاکێشانا زۆر هەبیت، کو دگەل گەردیلەکا دی پشکدارییێ دکەت ______ دیار دکەن.

**أ.** کارۆساڵبێتی دبیتە سفر

**ب.** کارۆساڵبێتی یا نزم

**ج.** کارۆساڵبێتی یا بلند

**د.** کارۆساڵبێتی یا وەکهەڤ

**5.** ئەو بەندێن ساخلەتا ئایۆنێنا وان دناڤبەرا 5% و 50% دا دهێنە هژمارتن ______ .

**أ.** ئایۆنی

**ب.** بتنێ هاوبەشن

**ج.** هاوبەشێن جەمسەردار

**د.** هاوبەشێن بێ جەمسەر

**6.** هەر چەند جوداهی دناڤبەرا کارۆساڵبیا دوو گەردیلێن پێکڤە بەندکری زێدەتربیت هەر چەند ڕێژا سەدی بۆ ______ دبەندێدا دێ زێدەبیت.

**أ.** ساخلەتێ ئایۆنی

**ب.** ساخلەتێ هاوبەشییێ

**ج.** ساخلەتێ کانزایی

**د.** بەشداری کرنا ئەلکترۆنان

**7.** ئەو ئەلکترۆنێن پشکدارییێ دپێکئینانا بەندا کیمیاییدا دکەن دبێژنێ ______ .

**8.** ئەو بەندا کیمیایی یا پێکهاتی ژ ئەنجامێ هەڤکێشانا کارۆستاتیکی دناڤبەرا ئایۆنێن موجەب وێن ساڵب دبێژنێ ______ .

ناڤ .................................... رۆژ .................................... پۆل ....................................

9. دەما ئەو ئەلکترۆنێن چووینە دبەندکرنا کیمیاییدا ل دەمەکێ درێژ نێزیك گەردیلەکێ دبورینن ژگەردیلەکا دیتر ئەو بەندێنە دێ ________ بیت.

10. ئەگەر ساخلەتێ بەندێنا ژ 50% ئایۆنی زێدەتربوو، دبێژنێ بەندا ________ .

11. ساخلەتێ بەندێنا پتر ژ 50% دێ ئایۆنی بیت، ئەگەر جوداهی یا کارۆسالبێتییێ دناڤبەرا دوو گەردیلادا مەزنتربیت ژ ________ .

12. شێووگێ کیمیایی بۆ ئاوێتەکی یان گەردەکێ بنڤێسە کو نموونا هەر ئێك ژئەڤێن خارێ بیت.

________ أ گەردەکا هاوبەشا بێ جەمسەر

________ ب ئاوێتەکێ هاوبەشێ جەمسەردار

________ ج ئاوێتەکێ ئایۆنی

13. چەوانییا پێك هاتنا بەندا هاوبەش ڕوون بکە.

________

________

________

14. دەما پێکهاتنا بەندا هاوبەش دناڤبەرا دوو گەردیلادا، کیژ ساخلەت دیار دکەت کو ئەڤ بەندە جەمسەردارە یان بێ جەمسەرە؟

________

________

________

15. بکارئینانا کارۆسالبیەتێ، ڕوون بکە چەوا دێ جوداهییێ کەی دناڤبەرا بەندا ئایۆنی وبەندا هاوبەشدا.

________

________

ناڤ .................................................................................... ڕۆژ ............................................... پۆل ..................................................

بەندێ 6
بەندێن کیمیایی

پێداچوونا پشکا 2-6
## بەندا هاوبەش وئایۆتێن گەردی

**کورتەبەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1.** بکارئینانا چەمکێ وزا ڤەشارتی، چەوانیا پێکهاتنا بەندا هاوبەش دناڤبەرا دوو گەردیلا وەسف بکە.

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

**2.** ناڤێ دوو توخمان بێژە کو وان ئایۆتێن پێك بینن نا کەڤنە لبن ڕێسایا هەشتی.

______________________________________________

______________________________________________

**3.** وزا بەندی، بەندە ب درێژیا بەندی بخۆ، ئەو زانیارێن خشتێ دهێت بکاربینە بۆ ڕێزکرنا بەندان بەرەو ئەڤراز (ژووری) لدوڤ درێژیا بەندێ ژیێ کورتر بۆ درێژتر.

أ.

| بەند | وزا بەندی (kJ/mol) |
|---|---|
| H — F | 569 |
| H — I | 299 |
| H — Cl | 432 |
| H — Br | 366 |

______________________________________________

ب.

| بەند | وزا بەندی (kJ/mol) |
|---|---|
| C — C | 346 |
| C ≡ C | 835 |
| C = C | 612 |

______________________________________________

______________________________________________

ناڤ ........................ ڕۆژ ........................ پۆل ........................

**4.** هێما لویس بۆ ئەڤ شێووگێن خوارێ وێنە بکە.

أ. $NH_3$

ب. $H_2O$

ج. $CH_4$

د. $C_2H_2$

ه. $CH_2O$

ناڤ .................................. ڕۆژ .................................. پۆل ..................................



پێداچوونا پشکا 3.6

# بەندا ئایۆنی و ئایۆنێن ئایۆنی

**کورتەبەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**.1** ———— هێماکاریا کلۆریدێ سۆدیۆم NaCl دبیتە ———— .

أ. یەکا ئێک شێوگ

ب. ئێک گەردە

ج. ئێک بلور

د. ئێک گەردیلە

**.2** ———— دبلورا ئاوێتەکێ ئایۆنیدا، هەر کاتەیۆنەک دۆرپێچکریە ب چەند ———— .

أ. گەردان

ب. ئایۆنێن موجەب

ج. دوو جەمسەرییا

د. ئایۆنێن سالب

**.3** ———— ب بەراوردی دگەل گەردیلێن هاوبارگ یێن دیارکری بۆ پێکئینانا ئاوێتەکێ ئایۆنی، تورا بلووری یا پەیدابووی دێ ———— هەبیت.

أ. بەرزترین وزا ڤەشارتی

ب. کێمترین وزا ڤەشارتی

ج. وزا ڤەشارتی وەکهەڤ

د. وزا نەجێگیر

**.4** ———— وزا تۆڕا ئاوێتێ A مەزنترە ژوزا تۆڕا ئاوێتێ B . چ دەرئەنجامدکەی ژ ڤێ ڕاستییێ؟

أ. ئاوێتێ A ئاوێتێ ئایۆنی پێک نائینیت.

ب. شکاندنا بەندێن ئاوێتێ A بزەحمەتترە ژیێ ئاوێتێ B .

ج. چێدبیت ئاوێتێ B گازبیت.

د. بلوورێن ئاوێتێ A مەزنترن ژبلوورێن ئاوێتێ B .

**.5** ———— هێزا ڕاکێشانێ دناڤبەرا گەردێن ئاوێتەکێ گەردیدا.

أ. بهێزترە ژهێزا هەڤکێشانا بەندا ئایۆنی

ب. لاوازترە ژهێزا هەڤکێشانا بەندا ئایۆنی

ج. نێزیکە دیەکسان بن بۆ هێزا هەڤکێشانا بەندا ئایۆنی

د. سفرە

**.6** ئەو هێزا دوو گەردیلان پێکڤە دگریت دبەندەکا ئایۆنیدا وەسف بکە.

ناڤ ........................ ڕۆژ ........................ پۆل ........................

**7.** چ جۆرێ وزێ هێزا بەندا ئایۆنی دەردبڕیت بشێوەکێ باشتر؟

**8.** جۆرێ بەندا ئاڤبەرا دنا ئایۆنێن فرە گەردیلەدا چییە؟

**9.** بەندێن ئایۆنی ئەوێن خشتێ خوارێدا بەرەڤ ئەڤراز (ژووری) ڕێك بێخە (ڕێزبکە)، ژلاوازترین بەند بۆ بهێزترین بەند.

| بەندا ئایۆنی | وزا تۆڕێ (kJ/mol) |
|---|---|
| NaCl | -787 |
| CaO | -3384 |
| KCI | -715 |
| MgO | -3760 |
| LiCI | -861 |

**10.** هێما لویس بۆ ڤی ئایۆنێ چەند گەردیلەیێ ل خوارێ وێنە بکە:

$NH_4^+$

ناڤ .................... ڕۆژ .................... پۆل ....................

بەندێ 6
بەندێنێن کیمیایی

پێداچوونا پشکا 4-6
# بەندا کانزایی

**کورتە بەرسڤ:** بەرسڤا ڤان پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

1. ـــــــ ئەلکترۆنێن هاوهێزی دکانزاندا ـــــــ .
   أ. گرێداینە ب ئایۆنێن موجەبێن دیارکریڤە
   ب. هەڤبشکە دناڤبەرا هەمی گەردیلێن هاوسێ
   ج. جێگیرە (نەلڤینە)
   د. خەمخورە ب پێکئینانا بەندێن هاوبەش

2. ـــــــ دشێین ڕاستیا ئەڤێ ڕوون بکەین کو کانزان شیانا ڤەقوتانێ یا هەی وبلوورێن ئایۆنی دپێتینە ژبەر:
   أ. بەندێن کیمیایی
   ب. هێزا لۆندۆن
   ج. پلێن گەرمیا هەلمانندنێ
   د. جەمسەری

3. ـــــــ دەما ڕووناهی ب ڕوویێ کانزایەکی دکەڤیت، ئەو ئەلکترۆنێن دکەڤنە ناڤ دەریاییەکا ئەلکترۆنا دا:
   أ. دێ ڕێکێ دەتە تێپەربوونا ڕووناهییێ
   ب. دێ پەیوەندییێ دگەل هندەك ئایۆنێن موجەب کەت
   ج. دێ هێتە ڤەگوهاستن بۆ ئاستێن وزێ یێن نزمتر
   د. جارەکا دی دێ تیشکێ مێژیت ودێ دەت ژی

4. ـــــــ ئەلکترۆنێن لڤلڤوك دبەندا کانزاییدا بەرپرسە ژ:
   أ. تەیسینێ
   ب. گەهاندنا گەرماتییێ
   ج. گەهاندنا کارەبێ
   د. هەمی ئەوێن هاتین

5. ـــــــ دەما کانزا ژێك دئێتە ڕاکێشان بۆ دروستکرنا تێلەکێ، بەندێن کانزایی دێ بنە ئەگەرێ:
   أ. زوی شکەستنا وان
   ب. زەحمەت بشکێن
   ج. نا هێنە شکاندن
   د. بەندێن ئایۆنی

6. چەمگێ ڕێزبوونێن ئەلکترۆنی بکاربینە بۆ شلۆڤەکرنا ئەگەرێ بۆچوونا ئەلکترۆنێن هاوهێزی یێن کانزا کو هژمارا وان کێمتربیت ل چاڤ هژمارا وان دزۆربەی ناکانزادا.

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

ناڤ ........................ ڕۆژ ........................ پۆل ........................

7. چەوا ڕەفتارا ئەلکترۆنان پشکداریێ دکەن دشیانا کانزان بۆ گەهاندنا گەرمێ وکارەبێ؟

---

---

8. پەیوەندی دناڤبەرا گەرمی هەلێنانا کانزاو هێزا وان بەندان ئەوێن پارچێن وی پێکڤە گرێ ددەت چییە؟

---

---

9. بکارئینانا بەهایێ بارگا کارەبێ وهژمارا ئەلکترۆنان، بەندا کانزایی یا لاواز وبەندا کانزایی یا بهێز وێنە بکە.

أ

ب

10. بەراوردییێ دناڤ کانزا وئاوێتێن ئایۆنی دا بکە برێکا تەمامکرنا خشتێ خوارێ.

| | کانزا | ئاوێتێن ئایۆنی |
|---|---|---|
| پێک هاتەکان | | |
| بارگا گشتی | | |
| گەهاندن | | |
| پلا شلبوونێ | | |
| ڕەقی | | |
| شیانا ڤەقوتانێ | | |
| شیانا ڕاکێشانێ | | |

ناڤ ................................ رۆژ ................................ پۆل ................................

بەندێ 6
بەندێنا کیمیایی

## پێداچوونا پشکا 5-6
# ئەندازەیا گەردان

**کورتەبەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1**. منگرتیا سەرەکی بۆ بیردۆزا VSEPR ئەوا بکارئینای بۆ پێشبینیکرنا شێوێ گەردیلان دیار بکە.

**2**. دگەردا ئاڤێدا دوو گەردیلێن هایدرۆجینێ وگەردیلەکا ئۆکسجینێ پێکڤە بەندن. بۆچی گەردا ئاڤێ گەردەکا ڕاستەهێل نینە؟

**3**. کیژ ئۆرۆپیتالێن ئێك دوو دگرن بۆ پێکئینانا ئۆرۆپیتالێن دووڕەگبووی $sp^3$ لدۆر گەردیلا کاربۆنێ؟

**4**. ئەو هەردوو هۆکار چنە کو جەمسەرداری وبێ جەمسەریا گەردان دیار دکەن؟

**5**. ئەڤان جۆرە وزەوبەندێن ل خوارێ بەرەو ئەڤزار (ژووری) ڕێزبکە ب ڕەنگەکی کو 1 لاوازترین و 4 بهێزترین بن:

_______ هاوبەشی

_______ ئایۆنی

_______ دوو جەمسەر – دوو جەمسەر

_______ هێزا بەلاڤبوونێ یا لەندۆن

ناڤ .................................... رۆژ .................................... پۆل ....................................

**6.** ئێك ودوو ڕاكێشانا هێزا دوو جەمسەری – دوو جەمسەری وهێزا بەلاڤبوونا لۆندۆن وبەندا هایدرۆجینی چەوا وەكهەڤ دبن؟

---

---

**7.** ئەڤ خشتێ ل خوارێ تەمام بكە:

| شێوگ | هێما لویس | وێنێ ئەندازەیی | جەمسەرگری |
|---|---|---|---|
| $H_2S$ | | | |
| $CCl_4$ | | | |
| $BF_3$ | | | |
| $H_2O$ | | | |
| $PCl_5$ | | | |
| $BeF_2$ | | | |
| $SF_6$ | | | |

ناڤ ........................ رۆژ ........................ پۆل ........................

بەندێ 6
بەندێن کیمیایی

# پێداچوونەکا هەمەجۆر

**کورتە بەرسڤ:** بەرسڤا پرسیارێن ل خوارێ بدە ل جهێ دیارکری دا:

**1.** ناڤێ جۆرێ ئەو وزا دهێتە بکارئینان وەك پیڤەر بۆ هەر ئێك ژ بەندێن خوارێ بێژە:

أ. بەندا ئایۆنی ________

ب. بەندا هاوبەشی ________

ج. بەندا کانزایی ________

**2.** بهایێن کارۆسالبییەتا دیارکری دشێوێ 5-20 دا ل بەرپەرێ 143 ژ پەرتووکا قوتابی بکاربینە بۆ دیارکرنا بەندێن ل خوارێ، ئەرێ هاوبەشا بێ جەمسەرن یان هاوبەشا جەمسەردارن یان بەندێن ئایۆنینە.

أ. $Na — Cl$ ________

ب. $H — O$ ________

ج. $H — H$ ________

د. $H — C$ ________

هـ. $H — N$ ________

**3.** جوداهی یا بەندا هایدرۆجینی دگەل هەر ئێك ژ بەندا ئایۆنی و بەندا هاوبەش چییە؟

________

________

________

**4.** پێکهاتنا هەردوو گەردێن $H_2S$ و $H_2O$ وەکهەڤن، وگەردیلێن واں یێن ناوەندی سەرب هەمان کۆمەڵەڤەنە. ژلایەکێ دیترڤە $H_2S$ گازا دپلا گەرمیێ یا ژووردا، بەلێ $H_2O$ شلە دپلا گەرما ژووردا. ب پشتبەستن لسەر بنەماییێن بەندێنا، ئەگەرێ ئەڤێ راستییێ روون بکە.

________

________

________

________

ناڤ ............ رۆژ ............ پۆل ............

5. هاوبەش بەندا جەمسەردار وبەندا ئایۆنی دچدا دوەکهەڤن؟

6. وێنێ هێما لویس بۆ ئەڤ شێوگێن خوارێ بنڤیسە، دیار بکە کیژ وان گەردا جەمسەردارە وکیژ بێ جەمسەرە.

أ. $H_2S$

ب. $COCl_2$

ج. $PCl_3$

د. $CH_2O$

# تاقیکرنا 8

# تاقیکرنا گوریێ

## بەرهەمێن فێرکاریێ

- دیارکرنا چەند پیڤەرێن ڕەنگان بۆ چەند ئایۆنێن کانزایی یێن هەلبژار.
- ڕەنگێن ڤەدیتنا گوریێ دزڤڕیتەڤە بۆ ڕەفتارێ ئەلکترۆنێن هاندراو دئایۆنیێ کانزاییدا.
- ناسینا ئایۆنەکێ کانزایی نە نیاس بڕێکا تاقیکرنا گوریێ.
- چەوانیا جێبەجێکرنا تاقیکرنا گوریێ (ناسینا ب گوریێ) وڕێکا بکارئینانا شەپەنگپیڤی ڕوون دکەت.

## کەرەستە وئامیرێن هەرکۆمەکێ





- گیراویێ $HCl$ (1.0 M)
- کوپەك ئێرا 250 mL
- چراکێ بەنزین وپاشکۆکێن وی
- گیراویێ $CaCl_2$
- سێنیەکا شویشەیی گەلەك چال
- پەل گاسك (ملقط جفنة)
- ئاڤا دلۆپێن
- تاقیکرنا گوریێ
- بۆریەکا تاقیکرنێ یا شووشەیی
- گیراویێ $K_2SO_4$
- گیراویێ $Li_2SO_4$
- گیراویێ $Na_2SO_4$
- گیراویێ $NaCl$
- خوێیا $NaCl$
- گیراویێ $SrCl_2$
- دەزگاییێ شەپەنگپیڤ
- گیراویێ خوێیەکا نە نیاس

## کەرەستێن دیتر (لدویڤ لێ خۆی)

- زلکێن داری، (شقارتە)

## پێشینەکا زانستی

گەردیلێن هەر توخمەکێ کانزایی هندەك ڕووناهی یا ئاشکرا ددەن کو بناغەیە بۆ ناسینەکا کیمیایی دبێژنێ ناسینا بگوری. بۆ دیارکرنا گەردیلەکا کانزایەکێ نەدیار، پێدڤی یە ل دەستپێکێ ئەو ڕەنگێن جوداکار ئەوێن گەردیلێن ژێك جودا پەیدا دکەن دیار بکەن. تو دشێی ب ئەوی کاری ڕاببی ب جێبەجێکرنا ناسینا ب گوریێ لسەر کۆمەکا گیراوێن پیڤای یێن ئاوێتێن کانزایی. پاشی ئەو تاقیکرن بهێتە جێبەجێکرن لسەر نموونەکا پێکهاتا نەناس وبەراوردیکرنا ئەنجامی ب گیراوێن پیڤای. هەبوونا هەر برەکێ هەر چەندا کێم بیت ژماددەکێ دیتر چێدبیت تێکەل ببیت دگەل کردارا دیارکرنا ڕەنگێ ڕاست بۆ وێ گەردیلا کۆمە دڤێت هەڵسەنگینین. ئەسەح بە ژپاقژیا ئامێران وئەڤێ کردارێ چەند جاران دووبارە بکە بۆ ئەسەح بوون ژئەنجامان.

## سلامەتی



**بەرچاڤکێن پاراستنا چاڤا بکە بەرچاڤێن خۆ وبەرکۆشکێ (صدرية) ل تاقیگەهێ بکە بەرخۆ بۆ پاراستنا چاڤ وجل وبەرگا.** وئەگەر چاڤێن تە تووشی ماددەکێ کیمیایی بوون زوی بشۆ وئاگەهداریا مامۆستای بکە.

## ئامادەكرن



**دەست نەكە چ ماددەكێ كیمیایی ل تاقیگەهێ.** وئەگەر ماددەیەك ڕشتە سەر چەرمێ تە یان جلكێت تە زوی بشۆ وئاگەهداریا مامۆستاییێ خۆ بكە.

ئەسەح بە ژخواندن وتێگەهشتنا ڕێنما ونیشانێ لسەر ئامانێ هەلاویستی وپێگیریێ پێ بكە. وپیچ پیچە ماددێن كیمیایی بكاربینە وئەوا ژبەر كارێ تە دمینیت بڕێژە.

**دەمێ بكارئینانا چراكێ بەنزن سەر وجلكێن خۆ باش گرێدە.** وئەگەر هات وئاگر بەربوو جلكێت تە ئێكسەر قەستا جهێ تەنگاڤیا بكە ل تاقیگەهێ یان بدە بەر ئاڤێ. وشویشێ شكەستی یان یێ درزلێ گەرم نەكە. پەل گاسكێ یان دەستگۆركێ بكاربینە بۆ هەلگرتنا شویشێن گەرم.

1. خشتەكێ زانیاریان بەرهەڤ بكە دپەرتووكا تاقیگەهێدا بشێوەیەكێ ستوین كو لیستا گیراوێن ئاوێتان تێدا دنڤێسیین. هەروەسا دەربارەی خوێیا NaCl وئەو گیراوێ پێدڤی ناڤەرۆكا وی دیاركەن. وخشتێ پێزانینا ببیتە سێ ستوینێن بەرفرەهـ كو ستوینەك بۆ تاقیكرنەكێ ئەوا دێ بێ ڕابی. پێدڤی یە ستوین دبەرفرەهـ بن كو تێرا پێزانین دەربارەی درێژییا پێلا ڕووناهیێ ورەنگی بكەت وتێبینیێن خۆ بنڤێسە لدۆر هەر تاقیكرنەكێ.

**خشتێ پێزانینا**

| ماددە | تاقیكرن 1 | تاقیكرن 2 | تاقیكرن 3 |
|---|---|---|---|
| 1.0 M HCl | | | |
| $CaCl_2$ | | | |
| $K_2SO_4$ | | | |
| $Li_2SO_4$ | | | |
| بلوورێن NaCl | | | |
| NaCl | | | |
| $SrCl_2$ | | | |
| گیراوێن نە نیاس | | | |

2. هندەك ژگیراوێ 1.0 M HCl بكە ئامانەكێ شویشەی یێ پاقژ. تێلا تاقیكرنێ باش پاقژ بكە وبكە دناڤ ئەڤی گیراوەیدا پاشی نێزیكی گوریا چراكێ بەنزینێ بكە. ئەڤێ كردارا هەنێ چەند جارا دووبارە بكە تا كو ڕەنگێ گوریێ وەك خۆ بمینیت وئێدی نەهێتە گوهارتن دەما نێزیككرنا تێلێ. هەكو تە تێلە ئامادەكر ئامانێ شویشەی ب ئاڤا دلۆپا بشۆ وپاشماوا پاقێژە.

3. دەما نەبوونا سێنیكا فرە چالْ، چەند دەفرێن بچویك بینە و 10 چپكا ژهەر ئێك ژگیراوە وماددێن ئامادەكری بكێ ژبلی NaCl. دەفرەكێ بچویك ژ 1.0 M HCl دانە بەرانبەر هەرئێك ژوان دەفرێن گیراوە وماددێن تاقیكری تێدایە. پێدڤییە تێلا تاقیكرنێ باش ب گیراوێ ترشێ HCl بشۆن.

## رێکا کاری

1. تێلیٚ بکە دناڤ گیراویٚ $CaCl_2$ دا پاشی بدە بەر گوریيا بەنزن. تێبینی یا ڕەنگیٚ گوریيٚ بکە وئەنجامیٚ لسەر خشتیٚ پێزانینا تۆمار بکە. ئەڤیٚ کریاریٚ جارەکا دی دووبارە بکە وبرێکا پیڤەریٚ شەپەنگی بەریٚ خوٚ بدیٚ ودرێژیا پێلان تۆمار بکە. هەر تاقیکرنەکیٚ سیٚ جاران بکە. پاشی تێلیٚ ب گیراویٚ HCl بشوٚ.



سێنیکا شویشەی فرە چالٚ

2. پێنگاڤا 1 دووبارە بکە بکارئینانا گیراویٚ $K_2SO_4$، هەروەسا دووبارە بکە بوٚ گیراوێن دیتر. ڕەنگیٚ گوریيٚ ودرێژیا پێلیٚ بوٚ هەر ماددەکیٚ تاقیکری تۆمار بکە کو برێکا ئامیریٚ شەپەنگیٚ وی هاتیە تێبینی کرن. پشتی تەمام بوونا تاقیکرنا کەل وپەلان بشوٚ وتێلیٚ پاقژ بکە وپاشماوا پاڤێژە.

3. پێنگاڤا 1 دووبارە بکە بکارئینانا گیراویٚ $Na_2SO_4$. ڕەنگیٚ گوریيٚ ودرێژیا پێلیٚ تۆمار بکە برێکا شەپەنگبینیٚ وتێلیٚ باش پاقژ بکە.

4. چپکەکا گێراویٚ $K_2SO_4$ بکە ئامانەکیٚ بچویك ییٚ پاقژ ودلۆپەکا گیراویٚ $Na_2SO_4$ بەردەسەر. گوریا تێلیٚ بیٚ بکارئینانا شویشیٚ کۆبالٚت تاقی بکە. تاقیکرنیٚ چەند جاران بکە بکارئینانا شویشیٚ کۆبالٚت. ڕەنگ ودرێژیا پێلێن گوریيٚ دخشتیٚ پێزانینا دا تۆمار بکە. پاشی تێلیٚ وئامێران ب ئاڤا دلۆپاو بشوٚ.

5. چپکەکیٚ ژگیراویٚ NaCl تاقیبکە ب نێزیککرنا وی بوٚ گوریيا بەنزن وبکارئینانا ئامیریٚ شەپەنگپێڤی (بیٚ بکارئینانا شویشیٚ کۆبالٚت). تێبینی یێن خوٚ تۆمار بکە. پاشی تێلیٚ وئامیران ب ئاڤا دلۆپاو بشوٚ وپاقژ بکە وئاڤا شویشتنیٚ برێژە. چەند بلوورێت NaCl بکە دئامانەکیٚ شویشەی وتێلیٚ بکە دناڤ بلوورادا پاشی تاقیکرنیٚ بوٚ ڕەنگیٚ گوریيٚ بکە وئەنجامیٚ تۆمار بکە ودەفر وتێلیٚ بشوٚ.

6. تاقیکرنا گوریيٚ بوٚ گیراوەکیٚ نە نیاس بکە بکارئینانا شویشیٚ کۆبالٚت. وتاقیکرنیٚ دووبارە بکە بیٚ بکارئینانا شویشیٚ کۆبالٚت. تێبینی یێن خوٚ تۆمار بکە.

## پاقژکرن ولادانا بەرمایکا

7. هەر چ دبیکەریدا هەبیت دانە لایەکی پاش پاقژکرنا وی ب ئاڤا دلۆپاو ووددەست شووێدا یان دئامانەکیٚ تایبەت کو ماموٚستای بەرهەڤ کربیت. پشتی بدوماهیك ئینانا شویشتنا کەل وپەل وجهیٚ کاری دەستێت خوٚ ژی باش بشوٚ وپاقژ بکە.

## شلۆڤەکرن ودەرئەنجام

1. **ڕێکخستنا پێزانینا:** دخشتیٚ پێزانینێن خوٚدا کورتیا ڕەنگیٚ هەر ئایۆنەکیٚ کانزایی دیار بکە.
2. **شلۆڤەکرنا پێزانینا:** ئەو جوداهیا تە تێبینی کری دهەر تاقیکرنەکا سەحکرنا گوریيٚ بوٚ هەمی ئایۆنێن کانزایی ئەوێن تە تاقی کرین ڕوون بکە.
3. **ڕێکخستنا هزران:** شرۆڤە بکە چەوا دیٚ پشکنینا گوریيٚ بساناهی کەی بکارئینانا شویشیٚ کۆبالٚت، وشلۆڤەکرنا وان ئایۆنێن تاقیکرن بوٚ هاتییە ئەنجامدان.

4. **بەراوردکرنا هزران**: ڕەنگێ گوریێ دوان سێ تاقیکرنێت تە کرین لسەر ئایۆنێن کانزاندا پێك بەراورد بکە، دباریێ ئێکێدا چاڤی ودباریێ دوویدا شەپەنگپێڤێ بکاربینە.

## دەرئەنجامەکان

1. **دەرئەنجامێن بەلگەپێدایی**: ئەو چ ئایۆنێن کانزایینە ئەوێن دناڤ گیراویێ نە ناسراودا هەین؟
2. **ڕێکێن هەلسەنگاندنێ**: چەوا بگوریێ ناسینێ لدویڤ هەستیاریا وی دێ پۆلێن کەی؟ وئەو گیر وگرفتە چنە کو چێدبیت بکەڤنە درێکا مەدا دەما دەستنیشانکرنا ئایۆنان برێکا سەحکرنا بگوریێ؟
3. **ڕێکێن هەلسەنگاندنێ**: چەوانیا بکارئینانا ئامێرێ شەپەنگپێڤەری بۆ دیارکرنا پێکهاتێن وان گیراوێن گەلەك ئایۆنێن کانزای تێدا شلۆڤە بکە.

## پەراوێزەکان

1. **دەرئەنجامێن بەلگەپێدایی**: ئەگەر مامۆستایەکی ناسینا بگوریێ بۆ چەند «گیراوێن نەنیاس» کر، وبۆ وی دیاربوو کو ڕەنگێ گوریا پەیدابووی پلێن جودانە ژڕەنگێ سوور، دڤێت قوتابی چ بکەت تا کو ب ڕاستی ئەڤان مادان بنیاسیت؟ بەرسڤا خۆ بدرێژی ڕوون بکە.
2. **هزر بۆ بجهئینانێ**: ناڤ ونیشانێن سێ دەفران ژئەگەرێ لێشووتێ (فیضان) بەرزەبوون. هەرسێ دەفران بلوورێت سپی نیتراتی سترونتیۆم، کاربۆناتا ئەمۆنیۆم وگۆگرداتا پۆتاسیۆم تێدا بوون. ڕوون بکە چەوا ئەڤان مادان دێ نیاسی وناڤ ونیشانێن ناڤەرۆکێن هەر دەفرەکی لسەر بدانی؟ (ئاگەدارکرن: ئایۆنێن ئەمۆنیۆم ڕەنگەکێ جودا یێ تایبەت پەیدا ناکەت).
3. **هزر بۆ بجهئینانێ**: هندەك جهـ بلوورێت سۆپا بەردین دفرۆشن. هەکو ئەڤان بلوورا بژاڵە کەین لسەر دارێ سووتی دا دێ گوریەکا شین یان سوور یان کەسك یان بنەفشی دەت. ڕوونکرنەکێ بدە ل دوو چەوانییا گوهۆڕینا ڕەنگێ گوریێ دەما پێداکرنا ئەڤان بلوورا. وتو پێشبینی دکەی پێکهاتێن وی چنە؟

ناڤ .................................. رۆژ .............................. پۆل ..................................

# تاقیکرنا 9 خۆلێتی یا ساخلەتێن ئۆکسیدان

## بەرهەمێن فێرکاری

- شیانا حەلیانا ئۆکسیدان دناڤ ئاڤێدا دیار دکەت.
- بەراوردیا شیانا حەلیانا دوو ئۆکسیدان دترشیێ بهێز وتفتیێ بهێز دا دکەت.
- ئۆکسیدان لدویڤ ترشاتی وتفتاتی وئەمفۆتیریێ پۆلێن دکەت (Amphoteric).
- ئەنجامێن تاقیکرنێ بجهێ توخمان ڤە گرێددەت دخشتێ خولیدا، وبساخلەتێن ئۆکسیدان ڤە گرێددەت دخول وکۆمەلێن خشتێ خولیدا.

## پێشەکی

هندەك ئۆکسید گیراوێن ترش پێك دئینن دەما حەلاندنا وان دناڤ ئاڤێدا. ئەڤ ئۆکسیدە وەك ئۆکسیدێن ترش (Acid anhydrides) دهێنە پۆلێن کرن، وژئەگەرێن سەرەکی یێن ترشە بارانانە. هندەك ئۆکسیدێن دیتر گیراوێن تفت پێك دئینن دەما حەلاندنا وان دئاڤێدا، ودبێژنە ئۆکسیدێن تفت (تفتۆکسید) (Basic anhydrides). وبشێوەکێ گشتی ئۆکسیدێن نەکانزایی گیراوێن ترش پێك دئینن وئۆکسیدێن کانزایی گیراوێن تفت پێك دئینن.

هەتا ئۆکسید بهێنە پۆلێن کرن بۆ ترش وتفتان پێدڤییە شییانا حەلیانا وان دترشەکێ بهێز وتفتەکێ بهێزدا تاقی بکەین. ئەڤجا ئەگەر حەلیانا ئۆکسیدی دتفتیێ بهێزدا پتربیت، وەك هایدرۆکسیدی سۆدیۆم دهێتە پۆلێن کرن بۆ ترشی. وبەرۆڤاژی، ئەگەر ئۆکسید دترشیێ بهێزدا پتر بحەلیێت وەك ترشیێ هایدرۆکلۆریك دهێتە پۆلێن کرن بۆ ئۆکسیدێ تفتی. وئەو ئۆکسیدێن ل ترش وتفتێن بهێزدا بحەلیێن دبێژنێ ئۆکسیدێن ئەمفۆتیری (Amphoteric oxides) یان دووکارلێك.

دئەڤێ تاقیکرنێدا ساخلەتێن چەند توخمان دێ خوینی. وبرێکا تێبینیکرنا تە بۆ ئەڤان ساخلەت وجهێن رێژەیی بۆ ئۆکسیدان دخشتێ خولیدا، دێ شێی پلە بەندا ساخلەتێن ئۆکسیدێن هاتینە خواندن برێکا خول وکۆمەلان دەرئەنجام بدەی.

## سلامەتی



**هەرگاڤ بەرچاڤکا دانە بەرچاڤێن خۆ وبەرکۆشێ بکە بەرخۆ دا پاراستنا چاڤ وجل وبەرگێن خۆ بکەی.** وئەگەر ماددەکێ کیمیایی چوو چاڤێن تە ئێکسەر بشۆ وئاگەهداریێا ماموستاییێ خۆ بکە. جهێ دوشا تاقیگەهێ یا تەنگاڤییا وجهێ دەستشووا چاڤان بزانە دگەل رێکێن بکارئینانا وان.

**دەست نەکە چ ماددێن کیمیایی.** ئەگەر چەرمێ تە یان جلکێن تە ببەر ماددەکێ کیمیایی کەت، ب ئاڤێ بشۆ وئێکسەر ئاگەهداریێا ماموستای بکە. پشتراستبە ژخواندن وتێگەهشتنا رێنما ونیشانێن لسەر دەفرێن تو بکاردئینی. ئەگەر ئەو رێنما ونیشانێن ب دەفراڤە چ هشیاری لسەر نەبوون مشێورا ماموستای بکە دا چ بکەی. تام نەکە چ ماددەکێ کیمیایی ل تاقیگەهێ. وئەو ماددێ ژبەر کاری دمینیت هەرگاڤ برێژە وماددا پیچ پیچە بهەلکێشە ژدەفردی دا پەلاچە نەبیت.



**گازی ماموستای بکە دەما رشتنا ماددەکێ کیمیایی.** وپێدڤی یە ماددێ رشتی باش پاقژ بکەی لدویڤ شیرەتێن ماموستای.

**دەما تو گورییا بەنزن بكاردئینی جلكێت خۆ بگەهینە ئێك وگرێدە.** وئەگەر ئاگر ما ب جلكێت تەڤە زوی قەستا دووشا تەنگاڤیا تاقیگەهێ بكە وبكاربینە بۆ ڤەمراندنا ئاگری. كەل وپەلێن شویشەی ئەوێن شكەستی یان درزلێ یان كونەك تێ بیت بكارنەئینە. گاسكێ یان دەزگۆركا بكاربینە بۆ گرتنا شویشە وكەل وپەلێن گەرم وداخ.

**شویشێ شكەستی نەكە دناڤ سەلّكا گلێشی بەلێ بكە سەلكەكا تایبەت.** چونكی دبیت شویشا شكەستی بكەیە دناڤ سەلّكێن تایبەت.

## ماددە وئامێرێن هەر كۆمەكێ

- گیراوێ HCl (6M)
- گیراوێ NaOH (6M)
- سێنیكا شویشەی 24 چاڵ تێبن یان 24 پەرداغێن شویشەی قەبارێ 25 mL
- كوپەك شویشەی تێرا 50 mL
- بوتلەك قەبارە 250 mL یان لولەك بۆ كۆمكرنا گازێ
- چراكێ بەنزن
- ڤەخوارنا گازێ كاربۆن
- تەبلیكەكا سیرامیكی
- كەڤچكەكێ كانزایی
- گەرمكەرێ كارەبایی
- پارچەك ژكارتۆنێ
- MgO
- دەرنخافكەكا فلینی (تەپەدۆر)
- $SnO_2$
- $SrCO_3$
- تولێ شویشەی
- گۆگرد
- بۆرییا تاقیكرنێ بچویك (هژمارە 4 )
- تەرمۆمەتر (نەجیوەیی)
- مێژۆكەكا زراڤ
- ڕابەرێ گشتی
- ZnO

## ڕێكا كاری

1. نموونەكا كێم ژئۆكسیدێ مەگنیسیۆم MgO بكە بیكەرەكێ بچویك وبرێكا مێژۆكەكا زراڤ چەند دلۆپێت ئاڤا دلۆپاو بكە سەر. تێكەلەی باش تێكڤەدە برێكا تولێ شویشەی. 3 چپكا ژگیراوێ ڕابەری بكە ناڤ وئەنجامی تۆمار بكە دخشتێ 1 دا.
2. 0.5 g ژكاربۆناتێ سترۆنشیۆم $SrCO_3$ دتەبلیكەكێدا گەرم بكە تا چ ژگازا $CO_2$ دناڤدا نە مینیت. پاشی هندەك ژنیشتوویێ SrO بكە بیكەرەكێ بچویك وپێنگاڤا 1 دووبارە بكە.
3. 25 mL ژئاڤێ گەرم بكە دكوپەكێ شویشەیدا قەبارا 50 mL لسەر گەرمكەرێ كارەبایی.

**4.** برێکا مێژۆکەکا زراڤ چەند چپکێت ئاڤا دلۆپاو بکە دەفرەکێ بچویك و 3 چپکا ژگیراوێ ڕابەرێ بکە سەر.

**5.** مێژۆکەکا زراڤ بنیڤی ڤەخوارنەکا گازا کاربۆنی یا هەلچوو بکە، وئەسەح بە کو مێژۆکا زراڤ چ بەرماهی یا ڤەخوارنێ تێدا نەمایە ودەرڤەی مژۆکێ ب ئاڤا دلۆپاو بشۆ.

**6.** دەما پلا گەرمی یا ئاڤێ دەدەفریدا ببیتە دناڤبەرا $70^{\circ}C$ وە $80^{\circ}C$ دەفرێ ئاڤێ ڕاکە ژسەر گەرم کەری. لایێ ڤەکری یێ مێژمێژۆکێ بکە دناڤ گیراوێ ڕابەری دا ولاییێ دی ژی بکە دەفرێ ئاڤا گەرمدا هەر وەك شێوێ (أ) دیار دکەت. بۆ ماوێ 30 چرکا خۆ بگرە تاکو گازا $CO_2$ دەرکەڤیت پاشی ئەنجامان دخشتێ 1 دا تۆمار بکە.



شێوێ (أ)

**7.** کوپەکێ تێرا 50 mL بنیڤی ئاڤ بکە.

**هوشیاری: گازا $SO_2$ زۆر دژوارە لەوڕا پێدڤییە ب هوشیاری کار دگەل بهێتە کرن.**

**8.** 10 mL ژئاڤا دلۆپاو بکە دناڤ لوولەکا کۆمکرنا گازی و 3 چپکێن گیراوێ ڕابەری بکە سەر. دکەڤچکێ سووتنێ دا پێچەك گۆگردی بسووژە برێکا گوریا بەنزن دەما گورییێ گۆڕدگرت بکە دناڤ لوولەکا کۆمکرنا گازی، ئەوا نیڤی ئاڤ هەر وەکی دشێوێ (ب) دا دیارە ودەرێ لوولەی ب پارچەکا کارتۆنێ بگرە.



شێوێ (ب)

**9.** پاش سووتنا گۆگردی بتەمامەتی دماوێ 30 چرکاداکەڤچکێ گۆگردی بکە دناڤ ئاڤا شویشێ 50 mL دا وکو گۆگردی ڤەمرینیت. پاشی شویشەی دائێخە وباش بشلقینە ژبەر حەلاندنا گازا $SO_2$. ئەنجامێن خۆ تۆمار بکە دخشتێ 1 دا. هەردوو پێنگاڤێن 10 و 11 مامۆستا دێ پێ ڕابیت.

10. ماموستا 20 چپکێت 6M NaOH دێ کەتە بوریێکا تاقیکرنێ کو ZnO تێدابیت، دگەل لڤاندنا بەردەوام. هەروەسا 20 چپکێن 6M HCl دێ کەتە بوریێکا دیتر کو ZnO تێدابیت، دگەل لڤاندنا بەردەوام. ئەگەر ئۆکسید دناڤ تفتێ بهێزدا بحەلییت ئەو ئۆکسیدێ ترشە، وئەگەر ئۆکسید دناڤ ترشێ بهێزدا بحەلییت ئەو ئۆکسیدێ تفتە. وئەگەر ئۆکسید دناڤ هەر ئێك ژ تفت وترشی دا بحەلییت ئەو ئۆکسیدێ دووکارلێکە (ئەمفۆتیرییە). ئەنجامێن خۆ دخشتێ 2 جێگیر بکە.

11. ماموستا پێنگاڤا 10 دێ دووبارە کەت بکارئینانا $SnO_2$ ل جهێ ZnO .

## پاقژکرن ولادان

12. هەمی ئامیرێن بکارئینایی یێن تاقیگەهێ بشۆ وهەمی ئامیران بزڤرینە جهێن وان یێن تایبەت. وپاشماوێن هەمی ماددا پاقێژە ودەستێت خۆ باش بشۆ بەری ژتاقیگەهێ دەرکەڤی ودوماهیك هاتنا کارێ تە.

| خشتێ 1 | | | |
|---|---|---|---|
| ئۆکسیدێ بکارئینایی | ڕەنگێ ڕابەری | pH | سروشتێ ئۆکسیدی (ترش، تفت، وئەمفۆتیری) |
| MgO | | | |
| SrO | | | |
| $CO_2$ | | | |
| $SO_2$ | | | |

| خشتێ 2 | | | |
|---|---|---|---|
| ئۆکسیدێ بکارئینایی | حەلاندن دناڤ 6M HCl | حەلاندن دناڤ 6M NaOH | سروشتێ ئۆکسیدی (ترش، تفت، وئەمفۆتیری) |
| ZnO | | | |
| $SnO_2$ | | | |

## چەند پرسیارەك

1. ڕێکخستنا ئەنجامان: لیستەکا بەراور (ئاسوویی) بۆ ڕەنووسێن کۆمەڵێن وان توخمان دروست بکە ئەوێن وان ئۆکسیدان پێك دئینن کو تە تاقیکرین یان ماموستای تاقیکرین وژکۆمەڵا 2 دەستپێ بکە. شێووگێن کیمیایی یێن ئەوان ئۆکسیدان بنڤیسە ئەوێن تاقیکرن بۆ هاتیە کرن لبن ڕەنووسێن کۆمەڵێن وان. ولبن هەر شێوگەکێ سروشتی وی ئۆکسیدی بنڤیسە ئەوێ تە ڤەدیتی کانێ (ترش، تفت، دووکارلێك)ە.

2. **ئەنجامێن بەلگەپێدای:** چەوا ساخلەتێن ئۆكسیدان دخشتێ خولیدا پلە بەند كرینە ژلایێ چەپێ بۆ لایێ ڕاستێ؟

3. **شلۆڤەكرنا ئەنجامان:** چەوا ساخلەتێن هەردوو توخمێن تاقیكرن بۆ هاتییە كرن ژكۆمەڵا 14 هاتینە ڕێزكرن؟

4. **بجهئینانا هزران:** بەرسڤا خۆ ڕوون بكە دەربارەی پرسیارا 3 برێكا پۆلكرنا هەردوو توخما بۆ كانزا یان نەكانزا.

5. **پێشبینی یا ئەنجامان:** پێشبینی بكە ئەوا تو فێربووی دڤێ تاقیكرنێدا، پێشبینیا ئەوی ساخلەتی بكە ئەوی ئۆكسیدێ $NO_2$ جودا دكەت، ئەرێ ئەو ئۆكسیدییێ ترشە یان تفتە؟ ب درێژی بەرسڤێ بدە.

6. **پێشبینی یا ئەنجامان:** برێكا تشتێ تو فێربووی دڤێ تاقیكرنێدا پێشبینی بكە كیژ وان تفترە SnO یان PbO ؟ ب درێژی بەرسڤێ بدە.

## دەرئەنجامێن گشتی

1. **بجهئینانا ئەنجامان:** ئەگەر تە دوو بۆرێن تاقیكرنێ هەبن ودوو ئۆكسید تێدابن. بۆرییا ئێكێ ئۆكسیدێ تفت CaO تێدایە وبۆرییا دووێ ئۆكسیدێ ئەمفۆتیری $As_4O_{10}$ ڕتێدایە. ڕێكەكێ پێشنیاز بكە بۆ پاقژكرنا هەردوو بۆریا.

2. **بجهئینانا ئەنجامان:** دەما ئاخ بۆ هندەك شینكاتییا دهندەك پارچاندا یا ترش بیت. تۆزا كلسی یان CaO لگییا وشینكاتییێن وان باخچان دكەن. ڕوون بكە چەوا ئەڤ كردەیە كار دكەتە ترشاتیا ئاخێ.

ناڤ ............................................ رۆژ ............................ پۆل ............................................

# تاقیکرنا 10 گەهاندنا کارەبێ وەك بەلگە لسەر جۆرێ بەندی

## ئەنجامێن فێرکاری

- تێبینی وبەراوردیا کارەبا گەهاندنا چەند ماددێن جودا دکەت.
- گەهاندنا ماددەی بۆ کارەبێ وجۆرێ بەندی پێکڤە گرێددەت.
- ناسنامەیا ماددەکێ نەناس دەستنیشان دکەت.

## پێشەکی

هەتا ماددەیەك کارەبێ بگەهینیت پێدڤی یە تەنولکێن بارگری ولڤلڤوك هەبن. چێدبیت ئەو تەنولکە ئەلکترۆنێن سەربەخۆبن دلڤینێدا هەر وەك دکانزاندا، یان ژی ئایۆنێن لڤلڤوکن وەك ئەوێن دناڤ گیراواندا یان خوێیێن شلەوەبووی، یان هندەك ئایۆنن دروست بووینە ژماددێن گەردی ئەوێن ژبەندێن هاوبەش – جەمسەر پێك دهێن کو ژێکڤە دبن دەما حەلاندنا وان دناڤ ئاڤێدا. ماددێن ئایۆنی یێن ڕەق ئەوێن دناڤ ئاڤێدا نە حەلهن پتریا وان ماددێن دابڕکەرن (Insulators) کارەبێ نا گەهینن. وئەو ماددێن بەندێن هاوبەش یێن بێ جەمسەر هەین ئەوژی ماددێن دابڕکەرن کارەبێ نا گەهینن. دڤێ تاقیکرنێدا دێ پیڤەرێن گەهاندنێ بکارئینی بۆ دەستنیشانا ناسنامەیا 10 ماددێن جۆرێن وان نە نیاس بن دهێنە هێماکرن ب پیتێن (أ)، (ب)، (ج)، (د)، (هـ)، (و)، (ز)، (ح)، (ط)، (ی). ئەو ماددە ژی لدویڤ ڕێزکرنا پیتان ئەڤەنە: گۆگرداتی سۆدیۆم، شەکر، گۆگرد، ئاڤا بۆریێ، ئاڤا دلۆپاو، تەنەکە، ئۆکسیدی تەنەکە (IV)، گرافیت، تۆزا تەباشیرا زەر، ڕەژی. دێ شێی بکارئینانا ئەنجامێن تاقیکرنا گەهاندنا کارەبێ وپێزانینێن دیتر هەمی ماددێن نەناس یێن سەری بنیاسی.

## سلامەتی



**هەرگاڤ بەرچاڤکێن پاراستنێ وبەرکۆشکێ تاقیگەهی بکە بەرخۆ بۆ پاراستنا چاڤ وجل وبەرکێن خۆ.** وئەگەر ماددەیەکێ کیمیایی چوو چاڤێن تە ئێکسەر بشۆ وبێژە مامۆستایێ خۆ. جهێ دوشا تەنگاڤییا وچاڤشووێ بزانە ودچاوانیا بکارئینانا وان شارەزابە.

**دەست نەکە چ ماددێن کیمیایی ئەوێن ل تاقیگەهێ بکاردئینی.** وئەگەر ماددەیەك ڕشتە ب چەرمێ تەدا یان جلکێ تەدا ب ئاڤێ بشۆ وئاگەهداریا مامۆستای بکە. پشتڕاستبە ژخاندن وتێگەهشتنا هەمی پێزانین وشیرەتێن خۆپاراستنێ ئەوێن لسەر دەفرێن تو بکاردئینی نڤێسی بن. وئەگەر دەستەپەیڤ (دەستەواژ) یێن هوشیارییێ لسەر کارتێن پێناسا نەبوون ژمامۆستایێ خۆ بپرسە چ بکەی. چ ماددەکێ کیمیایی یێ بکارئینای نە زڤڕینەڤە دەفرێ وی یێ سەرەتایی، برێن کێم ژماددێن کیمیایی بینەدەر دا پەلاچە نەبیت ونەهێتە هاڤێتن.



**گازی مامۆستایێ خۆ بکە دەما ڕشتن وبەلاڤبوونا ماددەکی.** پێدڤی یە ئەو ماددێ ڕشتی بشێوەیەکێ دروست بهێتە پاقژکرن ولدویڤ شیرەتێن مامۆستای بیت.

## کەرەستە وئامێرێن هەر کۆمەکێ

- ئاڤا دلۆپێن
- تولێ شویشەی یان دارکێن ددانا
- گەهاندناس
- 10 دەفر کو هەرئێکێ ماددەیەکێ نەناس تێدابیت وهەر دەفرەکی پیتا تایبەت ب هەر ماددەکی لسەر بیت
- کلینکس
- کەڤچك
- دەفرەکێ فرە چاڵ
- مێژمێژۆکەکا زراڤ

## رێکا کاری

1. هەر نموونەیەکێ ژ 10 ماددەیێن نە نیاس پشکنین بکە وتێبینی یێن خۆ ل دەفتەرا خۆ بنڤیسە. تێبینی ژی سەروبەرێ ماددەی (رەق یان شل)، ورەنگێ ماددەی وساخلەتێن مایی ڤەدگریت.
2. گەهاندناسی پشکنین بکە دا پشتڕاستبی ژئەوێ کو ڕووناهیێ ددەت دەما هەردوو جەمسەرێن وی دگەهیننە ماددێن گەهینەر بۆ کارەبێ.
3. کەڤچکەکێ پاقژ بۆ هەر ماددەیەکێ رەق ومێژمێژۆکەکێ بۆ هەر ماددەیەکێ شل بکاربینە. برێن کێم ژهەر ماددەیەکێ نە نیاس بکە چاڵەکێ ژچاڵێن دەفرێ فرە چاڵ. پشتڕاستبە ژجهێ هەر ماددەکی ددەفریدا. پێدڤی یە کەڤچك بهێتە پاقژکرن بۆ هەر جارەکا تو بکاربینی وهەروەسا مژمژۆك ژی ب ئاڤا دلۆپێن بهێتە پاقژکرن.
4. هەردوو جەمسەرێن گەهاندناسی باش بگەهینە نموونا ئێکێ ژماددێ نە نیاس، هەر وەك یا دیار دشێوێ (أ) دا. پشتڕاستبە ژگەهاندنێ ب تێبینی یا تە بۆ گەشبوونا ڕووناهی یا گلۆپا ناسەرەوەی. گاڤا هەردوو جەمسەر دگەهنە ئێك، دەزگا بخۆ دێ ڕوون بیت، هزر نەکە ئەڤە گەهاندنەکا ئەرێنی بیت بۆ ماددەی. هندەك ژئەنجامان دبیت لاوازبن وپێدڤی پتر وردبینی بیت. پتریا ماددەیێن خاوێن نە گەهێنەرن وپێشبینیا هندێ نەکە کو پتریا ماددەیێن داینەفتە گەهینەربن. هەمی تێبینی یێن خۆ ددەفتەرا خۆدا تۆمار بکە.
5. پێنگاڤا 4 دووبارە بکە دگەل نموونەیێن دیتر یێن نەناسراو. ئەسەح بە ژپاقژکرنا جەمسەرێن ناسەرەوەی پشتی بدویماهی هاتنا هەر تاقیکرنەکێ. دەربارەی نموونەیێن گەهینەر بۆ کارەبێ سەنگاندن بۆ دهێتە کرن لدویڤ پیڤەرێ ژ 4 نمران ژ 0 تا 4 ، نمرە 4 بۆ باشترین گەهینەرە. تێبینی یێن خۆ وپلێن گەهاندنێ ل دەفتەرا خۆ تۆمار بکە.




**شێوێ (أ)**

6. برێکا مژمژۆکێ 10 چپکێن ئاڤا دلۆپێن بکە سەر هەر ئێك ژهەر دەه نموونان، و ب دارکێ دداناباش تێکڤەدە. ودارکی ب کلینکسێ پاقژ بکە پشتی هەر کارئینانەکێ.

7. سەحکە ئەوا ڕویددەت بکە و ل دەفتەرا خۆ بنڤیسە دگەل هەر کارەکێ ڕویددەت دەربارەی شیانا حەلیانا نموونەیا یان تێکەلبوونا وان دگەل ئاڤێ.

8. تاقیکرنا سەری بۆ هەر تێکەلەکی بکە وئەنجامان تۆمار بکە.

9. هەمی ئامێران بشۆ وجهێ کارێ خۆ ل تاقیگەهێ پاقژ بکە پشتی تو بدوماهیك هاتی. وئامێران بزڤرینە جهێن وان یێن تایبەت. خۆ ژماددەیێن کیمیایی وگیراوان ڕزگار بکە وبکە دناڤ دەفرێن تایبەت کو مامۆستای بۆ تە دیارکرین. چ ماددەیێن کیمیایی نە ڕێژە دئاڤەرێژێدا یان دسەلکا گلێشیدا. دەستێت خۆ باش بشۆ بەری ژتاقیگەهێ ب دەرکەڤی.



## پاقژکرن وژێ خلاسبوون ژپاشماوان

1. **ڕێکخستنا هزران**: ب باوەری یا تە هەی جۆرێ بەندێ دهەر ماددەیەکی ژماددێن نە نیاس دا چییە ئەوێن تە تاقیکرین؟ وجۆرێ تەنۆلکێن بارگری یێن لڤلڤوك دئەڤان جۆرە بەندان دا چییە؟

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

2. **ڕێکخستنا هزران**: لدویڤ باوەری یا تە هەی جۆرێ بەندان چییە دوان نموونادا ئەوێن نەگەهینەر دبارێ باقژدا وپاشی بۆ نەگەهینەر هەکو دناڤ ئاڤێدا حەلاندین؟ جۆرێ تەنولکێن بارگری یێن لڤلڤوك دئەڤان جۆرە بەنداندا دیار بکە.

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

3. **ڕێکخستنا هزران**: لدویڤ بیروبۆچوونێن تە جۆرێ بەندان دهەر نموونەیەکێدا کو نە گەهینەر بیت دبارێ پاقژدا یان هەکو دگەل ئاڤێ تێکەل دبن چییە؟ ئەگەرێ نەبوونا تەنولکێن بارگری یێن لڤلڤوك دئەڤان جۆرە بەنداندا شلۆڤە بکە.

_______________________________________________

_______________________________________________

_______________________________________________

**4. ڕێکخستنا زانیاریان وڕاستیا هزران**: ئەڤ خشتێ ل خوارێ پڕ بکە ب وان پێزانینان ئەوێن دێ شێی بڕێکا وان جۆرێ بەندێ هەر ماددەکێ نە نیاس بزانی وشیانا وان بۆ گەهاندنا کارەبێ.

| ماددە | جۆرێ بەندی | گەهینەر (دبارێ پاقژ دا) | گەهینەر دەما حەلیانا وان دناڤ ئاڤێدا |
|---|---|---|---|
| تەباشیر | | | |
| ڕەژی | | | |
| گرافێت | | | |
| شەکر | | | |
| گۆگرد | | | |
| گۆگرداتی سۆدیۆم | | | |
| تەنەکە | | | |
| ئۆکسیدی تەنەکە | | | |
| ئاڤا پاقژ | | | |
| ئاڤا حەنەفییێ | | | |

* دشێین وەسا دانین هەبوونا بەندێن ئایۆنی ژبەر هەبوونا خویێ یێن ئایۆنی کو دشێن دئاڤێدا بحەلیێن.

## پێزانینێن بمفا

- تەباشیر پێکهاتی یە ژ $CaCO_3$ کێم دئاڤێدا دحەلییێت
- گۆگرد ماددەیەکێ گەردی یێ زەرەر ڕێکخستییە د 8 گەردێن بازنەییدا.
- گۆگرداتی سۆدیۆم ئاوێتەیەکێ ئایۆنی سپی یە دئاڤێدا دحەلییێت.
- تەنەکە کانزایە.
- ئۆکسیدی تەنەکە ئاوێتەکێ ئایۆنی سپی یە دئاڤێدا نا حەلیێت.
- ڕەژی جۆرەکێ کاربۆنی یە ئێککگرتنا گەردیلێن وی نەڕێکە.
- گرافێت جۆرەکێ کاربۆنی یە ئێککگرتنا گەردیلێن وی ڕێکی یە.
- شەکر ئاوێتەیەکێ هاوبەشێ بێ جەمسەرە دئاڤێدا دحەلییێت.
- ئاڤا دلۆپێنراو ئاوێتەکێ هاوبەشێ جەمسەرداره و چ خلتێن ئایۆنی تێدا نینن.
- ئاڤا دلۆپێن ئاوێتەیەکی هاوبەشن جەمسەرداره چ گلێشێن ئایۆنی تێدا نینن.
- ئاڤا حەنەفییێ گەلەك گلێش تێدانە کو دناڤ ئاڤێدا نا حەلیێن، وپتریا وان ژی گەردی وئایۆنی نە.

## دەرئەنجامێن گشتی

1. ل ستوینا پێنجیێ دخشتەیدا، هێما نموونەیا نە نیاس یا ماددەی دهەر ڕێزەکێدا بنقیسە. وئەو ئەگەرێن پێدڤی بۆ دەستنیشانکرن وناسینا ناسنامەیا هەر توخمەکی شلۆڤە بکە.

2. **نەخشەدانانا تاقیکرنا وپێشبینیا بەرهەمان**: پێشبینی بکە ژڤاڤ ماددێن ل خوارێ کو شیانا گەهاندنێ هەبیت وئەگەرێ پێشبینێ یا خۆ ڕوون بکە. حەلاندنا هەر ماددەیەکێ دناڤ ئاڤێدا چ کار دکەتە سەر بارێ گەهاندنێ؟
ڕاستیا پێشبینی یا خۆ تاقی بکە ب ڕازەمەندیا مامۆستای بۆ هەمی ماددان ژبلی برومێ شل کو یێ مەترسەدەما کار دگەل دهێتە کرن.

**أ.** بزمارا ئاسنی

**ب.** برۆمێ شل $Br_2$

**ج.** شەمالك (مۆم) (گەردێن نارێکن زنجیرێن بێ جەمسەر ژ گەردیلێن کاربۆن وهایدرۆجینی پێك هاتینە).

**د.** گیراوەکێ ڕوون یێ ترشێ هایدرۆکلوریك $HCl(aq)$

**ه.** خوێیا خوارنێ $NaCl$

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

**تێبینی**: ئەو کەسێن ل تاقیگەها کار دکەن دڤێت مەشق لسەر ئەڤان ئەسراوانە بکەن.







شێوێ (أ)